پێشەکی :

بسم الله الرحمن الرحيم

أن الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعذو بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهدة الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادى له ، واشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسله ...

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝١٠٢﴾ [آل عِمْرَان : ١٠٢]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ۝١﴾ [النِّسَاء : ١]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ۝٧٠ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ۝٧١﴾ [الْأَحْزَاب : ٧٠ - ٧١]

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدى محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة فى النار أما بعد ...

قال تعالى :﴿ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ ۝٦١﴾ [آل عِمْرَان : ٦١]

واتە : ئەمە (موباهەلە)ی پێ ئەووترێ دوای ئەوە دوعا ئەکەین لە خوای گەورەو بەیەکەوە دەست بەرز ئەکەینەوەو ئەڵێین: لەعنەتی خوای گەورە لەو کەسە بێ کە درۆ ئەکات لەعنەتی خوا لە درۆزنان بێ ئەوکاتە دوعاکە جێبەجێ ئەبێ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بێن ئەم موباهەلەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - صلى الله عليه وسلم - بکەن زانیان کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ڕاستگۆیەو خۆیان درۆ ئەکەن، کە ئەمە ساڵی نۆی کۆچی لەسەر گاورەکانی نەجران دابەزی .

بەلێ بێ گومان درۆ کردن کلیلی هەموو خراپەیەکە ، بۆ ئەوەی خراپە نەکەی درۆ مەکە ، چونکە درۆ کردن دەستپێکی هەموو خراپەیەکە ، هەر بۆیە به درۆ کردن خراپە دەست پێدەکات ، چونکە گەر مرۆڤ درۆ نەکات ناتوانێ هیچ خراپەیەکیش بکات ، بەلام کاتێك درۆی کرد ئەوا بە دلنیایەوە دەرگایی هەموو خراپەیەکی لێ دەکرێتەوە ، چونکە ووتمان درۆ کردن کلیلی هەموو خراپەیەکە ، وە درۆ کردن خۆی ئامادە دەکات بۆ خراپەکاری و گەندەلی فسادی لە سەر زەوی ، بۆیە مرۆڤ دەبێت هەمیشە بە دوور بێت لە درۆ کردن و ووشەی ناراست ،بۆ ئەوەی هەموو کات کەسێك بێت لە مرۆڤە جوان و متمانە پێکراوەکان و رەوشت بەرزەکان ، ئەمەش بە دلنیایەوە ئەم سیفەتە جوانانە بە راستگۆیی بەدی دەهێنرێت ، چونکە کە درۆت کرد دلنیابە درۆت لەگەل دەکرێت ، پرسیارێك دێتە ئاراوە تۆ بێنە پێش چاوی خۆت گەر کەسێك درۆت لەگەل بکات ئەوکاتە هەستت چۆن دەبێت ..؟! یان هەست بە چ نارەحەتی و ناخۆشەیەك دەکەی..؟! ئایا هەستت چۆن دەبێت بەرانبەر کەسی درۆزن ..؟! بەلێ دلنیابە هیچ کەسێك نایەوێ درۆی لەگەل بکرێت بە تۆشەوە ..؟! هەر بۆیە هەرگیز یەکێك مەبە لەو کەسانەی درۆ دەکەن و راستگۆنین و دوورن لە گوفتار و رەفاری راستگۆیی ..! ! چونکە ئەی براو خۆشکی بەرێز تۆ ئەگەر درۆ بکەی لە گەل مرۆڤێك وای لێدەکەی متمانەی بە هیچ مرۆڤێکی تر نەمێنێ ، دەبێتە هۆی لە دەستدانی متمانە لە نێوان مرۆڤەکان یان لە نێو کۆمەلگا، ئەمەش زۆر گرینگە بەرپرسانی ولات راستگۆبن لەگەل گەلەکەیان چونکە دەبێتە هۆی متمانەبوون بلاوبوونەوەی راستگۆیی لە نێو تاکە کانی کۆمەلگادا، هەر بۆیە ئەگەر درۆ بکەین لە گەل یەکتریدا ئەوا ترسێك دروست دەبێت مرۆڤەکان لە گەل یەکتری متمانەیان نامێنی ، یان ترسێك دەخەیتە نێو دل کە ترسی لە کەسانی راستگۆترین مرۆڤیش هەبێت ، درۆ کردن جگە لە خراپە هیچ شتێکی باشت بۆ ناهێنێ تەنانەت بەر نەفرەتی (خوای گەورە ) دەکەوێت ، بۆیە لە کۆتاییدا نووسینی ئەم بابەتەم بۆ ئەوەی کە لەم سەردەمە درۆ کردن زۆر بووە تەشنەیی سەندوە ، منیش هەم لەسەر کارەکەم راستگۆیی پەیرەوە دەکەم هەم هانی دەورە بەرەکەشم دەدەم کە درۆ نەکەن چونکە کلیلی هەموو خراپەیەکە ، بەلێ کەسانێك هەندە رقیان لە درۆکردن ، کەسانێکیش لەم سەردەم هەن ئەلێن : بە درۆ کردن نەبێت ژیان ناچێتە سەر ، یان جۆرێك لە مرۆڤەکان درۆ دەکەن ناشیانەوێت کەس درۆ یان لەگەل بکە، ئیتر هیوادارم ئەم بابەتەم سوودێك بە ئیمانداران ببەخشێت لە گەل راستگۆیان حەشر بکرێن..؟!

# پێناسه ی درۆ

یەکەم : پێناسەی درۆ لە رووی زمانەوانیدا :

ماده ی (الکذب) واته : ( درۆ کردن له زمانی عەرەبی دا لەم سێ پێته پێکهاتووه ( الکاف ، الذال ، والباء ) له ئەصلدا تەواوه ، درۆ پێچەوانەی راستگۆییه یان راستیه ).[1]

دووەم : پێناسەی درۆ کردن لە رووی زاراوەی شەرعیەوە :

له (الجرجانی ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : ( درۆ کردن واته: هەوال پێگەیاندنی شتێکه یان رووداوێکه به پێچەوانی واقیع ، جا ئەم درۆ کردنه به ووته بێت ، یان به ئاماژه کردن بێت ، یان به بیّ دەنگ بوون بێت لەو واقیع و راستیەکه هەیه دەیشارێتەوه ).[2]

له (الکفوی) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : ( درۆ کردن واته : هەموو هەوالێك له هەوال گەیەنەرەوبێت ، که پێچەوانەی هەوالەکەبێت ، ئەوا پیّ دەوترێت درۆ).[3]

له (ابن منظور ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : (درۆ کردن واته: دژی یان پێچەوانه راستگۆییه ).[4]

ووتراوه : درۆ کردن رەنگه ئینکاری حەقیقەتێك یان راستیەك بێت ، که سەر پێچی کردووه و گوێرایەلی نەکرد بێت ..؟!

ووتراوه : دەکرێت ئیماندار یان موسلمان ، رەزیل یان بخیل بێت و جبان و ترسنۆك بێت ، بەلام ناکرێت به هیچ شێوەیەك له شێوەکان درۆ زن بێت ..؟!

ووتراوه : درۆ کردن واته : ووتنی شتێکه به درۆ ، کەواته : ئەو راستیه که هەیه بیشاریتەوه ، وه ئاشکرای نەکەیت بۆ بەرژەوندیەکی تایبەتی خۆی ..؟!

---

[1]-مقاييس اللغة ، ابن فارس (١٦٨/٥).
[2]-التعريفات ، الجرجاني ص ٧٤.
[3]-الكليات ص ٧٤٢ .
[4]-لسان العرب ، ابن منظور (٧٠٤/١).

# چەمکی درۆ کردن

کەواتە : درۆ کردن گوفتارێکە یان کردارێکە کە ئەنجامدەدرێت ، ئەم کەسە بە پێچەوانە یان دژی راستی ئەنجامی دەدات ، بێ گومان درۆ خەسلە تێکە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا هەیە ، چونکە لەو رۆژەی کە مرۆڤ چاوی بە دونیادا هەلدەهێنی ئەوا دەوروو بەری خۆی دەناسێت تا ئەو رۆژەی مردنی یەقەی دەگرێت ، دەچێتەو بۆ لای پەروەردگاری خۆی ، ئینجا لە ژیانی دونیادا هەموو مرۆڤێك یەك لەم دوو خەسلەتەی هەیە ، ئەویش راستگۆییە یان درۆ کردنە ، تەنها پێغەمبەران و پیاو چاکان درۆیان نەکردووە ،ئەوەی تر لەمرۆڤ بێ گومان لە ژیانی دا کەم کەس هەبێت جگە لەمانەی کە باسمان کرد درۆی نەکردبێت ، ئیتر ئەم درۆ کردنە لە هەر قوناغێکی ژیانی دا بێت ، هەر بۆیە مەبەست لە درۆ کردن ئەویش خۆ دەر باز کردنە لە بارودۆخێکدا یان بەرژەوەندی تاکە کەسی بۆ تەماعی دونیادا ، یان بۆ دوور کەوتنەوەیەك لە سزا ئەشکەنجە ، وە یان بۆ ئەوەی لۆمەو سەرزەنشت نەکرێت ، یان بۆ ئەوەی لێ پرسینەوەی لە گەلدا نەکرێت ، یان بۆ ریایی کردنی شتێك ، یان بۆ مجامەلە کردن و خۆ بردنە پێش بۆ کەسێکی گەورە یان بەر پرسێك ، هەروەها ئەم درۆ کردنە بۆ خۆ خۆشەویست کردن بۆ کەسێك ، یان فریودانی کەسێك یان کۆمەلە کەسێك ..؟!بەلێ (خوای گەورە ) ئیماندارانی بە پاك و بێ گەرد هەلبژاردوون لە رووی کردار و گوفتار و بیر و باوەرەوە ، لە رۆژی قیامەتدا تەنها راستگۆیان رزگاریان دەبێت ، و راستگۆییش بێ گومان نیشانەی بەختەوەری و کلیلی هەموو سەر کەوتنەکانە ، هەلبەتە دۆر کردنیش کلیلی هەموو خراپەکاریەکە ، بۆیە راستگۆیی رووح و دلّ و پۆشاك و رێ نیشاندەری راستەقینەی مرۆڤەکانە ، بەلام درۆ کردن نیشانەی مرۆڤی موناڤق و دوو روو و رێگە خۆشکەرە بۆ گشت تاوانەکان ، لەم بارەویەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا : ( ئایا مرۆڤی موسلمان دەترسێت و ترسنۆکە ..؟! فەرمووی : بەلێ . جاری وا هەیە کە مرۆڤی باوەردار روو بەرووی ترس دەبێتەوە،ئینجا پرسیار کرا : ئایا موسلمان بەخیل و رەزیلە ..؟! فەرمووی: بەلێ. جاری وا هەیە مرۆڤی باوەردار ئەم رەوشتەی تێدایە ، پاشان پرسیار کرا : ئایا باوەردار درۆزنە ..؟! فەرمووی : نەخێر . واتە : باوەر و درۆ لە دلی مرۆڤ باوەردار دا بەیەکەوە کۆنابنەوە ، چونکە باوەر رووناکیە و درۆ کردنیش تاریکیە ..؟!

# باسی درۆکردن

بەلێ درۆ کردن بە شێوەیەکی گشتی گوناهێکە لە گوناهە گەورەکان ، درۆزن گەر تەوبە نەکات ئەوا بەدلنیایەوە سزاکەی ناو ئاگری دۆزەخ دەبێت ، هەروەها مادەی درۆکردن لە قورئانی پیرۆز دا زیاتر لە (٢٨٢) جار هاتووە ، هەر هەمووی باس لە ناشرینی و قێزەونی و نابەجێ ئەم رەوشتە نزمە دەکەن ، هەروەها کۆتایی چارەنووسی درۆزنان بە دیار دەخات کە بە سزایی سەختی دۆزەخ ئەگەن ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (نەکەن درۆ بکەن ، چونکە درۆ کردن رێنموونیتان دەکات بەرەو هەموو تاوانە کان ، تاوانەکانیش رێنموونیتان دەکەن بەرەو ئاگری دۆزخ ، وە بەردەوام کەسێك درۆ دەکات و بە شوێن درۆوەیە هەتاکو لە لای (خوای گەورە) بە درۆزن دەنووسرێت ) هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يُؤۡفَكُ عَنۡهُ مَنۡ أُفِكَ ۝٩ قُتِلَ ٱلۡخَرَّٰصُونَ ۝١٠﴾ [الذَّارِيَات : ٩ - ١٠]واتە: هەر کەسێك قورئانی پیرۆز بە درۆ بزانێ لائەدرێ لەسەری وە خوای گەورە هیدایەتی نادات..؟! [ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ] نەفرەتی خوای گەورە لەو کەسانە بێ کە گومانیان هەیە لە بەڵێن و هەڕەشەکانی خوای گەورەو زیندووبوونەوە، یان ئەوانەی کە پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - قورئانەکەی خوای گەورە بە درۆ ئەزانن..؟!

وە لەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : نیشانەی مرۆڤی مونافق یان دوو روو سێ یانن :

١–کاتێك قەسەی کرد درۆ دەکات .

٢–ئەگەر بەلێنی دا نایباتە سەر .

٣–کاتێك ئەمانەتی پێسپێردرا خیانەتی لێ دەکات .

لە(معاويه بن حيده القشيرى ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ويلٌ للذى يحدِّثُ فيكذبُ لِيُضحكَ بِهِ القومَ، ويلٌ لهُ، ويلٌ لهُ)) . [٥] واتە: تیاچوون ( یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەلك بهێنێتە پێکەنین ، تیاچوون (یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆی ، تیاچوون (یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆ ی ..؟!

[٥]-سنن ابو داود برقم (٤٩٩٠).

## ئەو ووشانەی کە هەمان واتای (الكذب) لە قورئانی پیرۆز دا

یە کە م : (الزور) واتە: چاك كردنی شتێك ، بە وەسف كردنی پێچەوانەی وەسفە كەی خۆی ، واتە: بە جۆرێك كە هەر كەسێك ئەم شتە ببینێ یان ببیبیستێ یان وا بێتە بەرچاو كە جیاوازە لەوەی راستە كەی ..؟! .[٦]

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالی: ﴿وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ٣٠﴾ [الحَج : ٣٠] واتە: وە خۆتان دووربخەنەوە لە قسەی پووچەڵ و بەتاڵ و بێ بنەما، یان لە شایەتی ناحەق..؟!

دووەم : (الافتراء) واتە: داهێنانی دۆسەیەك یان شتێك كە هیچ بنەمایەكی نیە ، یان هیچ راستیەكی تێدانیە ..؟! [٧]

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ٨﴾ [سَبَإ : ٨] واتە : ئەیانووت: ئایا ئەمە درۆی بۆ خوای گەورە هەڵبەستووە [ أَمْ بِهِ جِنَّةٌ ] یاخود شێت بووە [ بَلِ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ فِي الْعَذَابِ ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: وانیە بەڵكو ئەوانەی كە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە ئەوان لە سزای بە ئێش و ئازاردان [ وَالضَّلَالِ الْبَعِيدِ] وە لە گومڕاییەكی زۆر دووردان و حەقیقەت و ڕاستی شتەكانیان لێ ون بووە..؟!

سێ یەم : (الإفك) واتە: ئەمە زۆر گەورە ترە لە دۆر ، هەر بۆیە هەموو ئەفك لە قورئاندا بە مانای دۆر كردنە ، بەلام درۆ یەكی زۆر گەورە ..؟! [٨]

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ [النّور : ١١] واتە : {ڕووداوی بوهتان كردن بۆ عائیشەی دایكی باوەڕداران (حادثة الإفك)} [ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ ] ئەو كەسانەی كە ڕووداوی ئیفك و بوهتان هەڵبەستنیان بۆ (عائیشە)ی دایكی باوەڕداران هەڵبەست، كە لە (بوخاری و موسلیم و سونەنەكان)دا هاتووە كە ئەم دە ئایەتە لەسەر پاكێتی (عائیشە) دابەزی، دوای ئەوەی لە یەكێك لە

[٦]-جامع البيان (٣١٤/١٩).
[٧]-الكليات ابو البقاء الكفوي ص١٥٤، مقاليد العلوم السيوطي ص٢٠٧.
[٨]- الكليات ابو البقاء الكفوي ص.١٥٣

غەزاکاندا دوا کەوت وە (صەفوانی کوڕی موعە¬طەل)یش دواکەوت پاشان (صەفوان) (عائیشە)ی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کە مونافیقان بینیان هەردووکیان بەیەکەوە دواکەوتوونە بوهتانیان بۆ (عائیشە) کردو وتیان: لەگەڵ (صەفوان)دا زینای کردووە، جا ئەو کەسانەی کە ئەو بوهتانەیان کردو ئەو درۆیەیان هەڵبەست [ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ] کۆمەڵێك بوون لە ئێوە کە (حەسانی کوڕی ثابت و میسطە¬حی کوڕی ئوثاثەو حەمنەی کچی جەحش) بوون و لەمانەوە بیسترا [ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ ] وا مەزانن کە ئەمە شەڕو خراپە بێت بۆ ئێوە بەڵکو بەهۆیەوە ئەجرو پاداشتی زۆر وەرئەگرن [ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ] بەڵکو ئەمە خێرو چاکەیە بۆ ئێوەو بەخێر بەسەرتاندا ئەشکێتەوەو پلەتان بەرز دەبێتەوەو خوای گەورە گرنگی و بایەخی بە (عائیشە) داو لەسەری هاتە وەڵام و بەرگری لێکردو پاکێتی دەرخست و ئایەتی لەسەر ناردە خوارەوە [ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ] وە هەر یەکێك لەوانەی کە ئەو قسەیەی کردووە بەشی خۆی تاوان هەڵئەگرێ [ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ ] بە ڵام ئەو کەسەیشی کە سەرەتا بە ئیشەکە هەڵساوەو سەرپەرشتی کرد کە (عبداللە¬ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)ی سەرۆکی مونافیقان بوو [ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] ئەمە سزایەکی یەکجار گەورەی هەیە لای خوای گەورە، وە سیانەکەی تریش کە لێیان بیسترا پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - یەکی هەشتا جەڵدەی لێ دان..؟!

**چوارەم : (البهتان) واتە: بەمانای (الافتراء) لە سەر خەلکی دا ، واتە : هەواڵێکی ناراستە ناکرێت گومان بکەیت ئایا دۆر یە یان نا ، بەلکو نابێت گومان ببێن کەدرۆیە ، بەدلنیایەوە درۆیە ، چونکە ئەو کەسەی کە دەگێریتەوە بوختان دەکات ..؟!**[٩]

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ ١٦﴾ [النُّور : ١٦]
واتە: وە ئەبوایە بتانوتایە پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە کە کراوە بۆ عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت)..؟!

[٩] -التحرير التنوير ، ابن عاشور (١٤٨/٢٨).

# ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی درۆکردن

١–کەمبوونی ترسی لە (خوای گەورە) و غافل بوون یان بیٚ ئاگایی لە یاد کردنی(خوای گەورە) یان نەزانین و جاهل بوون لەوەی کە نەزانی(خوای گەورە )چاودێری هەلسوکەوتنە کانی دەکات.

٢–هەولدان بۆ گۆرینی راستی لە پێناوی بەرژوەندی تایبەتیەکان بۆ خۆ دزینەوە لە راستی بەدیار خستی دۆر بۆ گەیشتن بە ئامانج مەرامی تاکە کەسی .

٣–لە پێناوی سەرنج راکێشانی بۆ خۆی بە چیرۆك و قسەی نەستەق و ناراست ، واتە: بە درۆ کردن سەرنجی خەلك بۆ خۆی رادەکێشیت ، قسەی هیچ و باتل پووچ و بیٚ بنەما دەکات .

٤–خۆ دزینەوە لە راستیەکان و هەست نەکردن بە بەر پرسیاریەت لە نێو کۆمەلگادا .

٥–راهاتن لە سەر درۆ کردن لە تەمەنی بچووکی یەوە تاکو پیر دەبێت ئەمەش لە باوانیەوە بۆی ماوەتەوە بەم پەروەردە قێزەونە تێپەری وە ، خۆی دەکاتە پالەوان لە ناو خەلکیدا بەدرۆکانی.

٦–خۆ هەلکیشان بە درۆ و زمان لووسیەکەی ، هەولدەدات بە ماستاو چەیەتی بەرانبەراکانی رازی بکات زمانی لووس بکات بەدرۆ کان بۆ گەیشتنە بە مەرامە قێزە وونەکانی خۆی .

٧–چاو لیٚ کردن دیاردەی درۆ کردن لەم زمانە ، خەلکانێك وا هەست دەکەن ، ئەوانەی دەوروبەری خۆی بەدرۆ کردن بوونەتە خاوەنی مال و سامان یان پلەو پۆستیان بە درۆ کردن بە دەست هێناوە ، واتە: دیاردەی چاو لیٚ کردن هۆکارێك بۆ درۆ کردن لە نێو کۆمەلگا دا .

٨–درۆ کردن لە لایەن کاربەدەست و بەرپرسان ئەمەش هۆکارێکە کە تاکەکانی نێو کۆمەلگا چاو لە بەرپرسانی خۆیان بکەن ، چونکە نابێت هەر گیزاو هەر گیز کار بەدەستان درۆ بکەن ، لە بەر ئەوەی خەلکی چاو لەوان دەکەن و دەبێتە دیاردە لە نێو کۆمەلگادا .

# پەتی درۆ کردن کورتە

بەڵێ دەگێرنەوە دەڵێن : رۆژێکیان ئافرەتێك دەچێتە لای مریشك فرۆشێك مریشك بکرێ، بەلام دووکاندارەکە ویستی دووکانەکەی دابخات ..!!

ئافرەتەکەش : پرسیاری لێ کرد ئایا مریشك هەیە ..؟!

دووکاندارەکەش سەریری ناو سەلاجەکەی دەکاتەوەو تەنها یەك مریشك ماوە ئەویش دەڵێت : بەڵێ مریشك ماوە، ئەویش دەر دەهێنێت و ، وە لە سە تەرازووەکە دایدەنێ ، بە ئافرەتەکە دەڵێ : ئەمە یەك کیلۆو نیوە..!!

ئافرەتەکەش سەیری دەکات تەماشادەکات مریشکە کە بچووکە وەزنی کەمە ، بە دووکاندارەکە دەڵێت : ئایا مریشکی لەمە گەورەترت لا نیە ..؟!

دووکاندارەکەش مریشکەکە دەگەرێنێتەوە نێو سەلاجەکە دووبارە هەمان مریشك دەر دەهێنێتەوە ، بەلام ئەم جارە پەنجەی لەسەر تایی تەرازووەکە دادەنێت ، مریشکە کە دەبێت بە دوو کیلۆ غرام ..!!

ئینجا ئافرەتەکە دەڵێت : زۆر باشە هەر دوو مریشکەکە دەبەم ئەوەی یەك کیلۆ نیو ئەوەی دوو کیلۆ کە ..؟!

دەڵێن : تا ئێستا مریشك فرۆشەکە سەری لە سەلاجەکە دەرنەهێناوە بە شوێن مریشکی یەکەم دا دەگەرێت ..!! هەر بۆیە پەتی درۆ کورتە تەنها لە چەند دەقیقەیەك درۆ کە ئاشکرا بوو ..!!

بەڵێ راستی و حەقیقەتت لە بیر نەچێ ، پەتی دۆر کورتە ، و شەرمەزاری بە شوێنە ، مرۆڤ راستگۆ لە هەمووکات خۆشەویستە ، وە کەسی درۆزن هیچ کەس خۆشی ناوێت ، چونکە بە درۆ کردن متامنەی کەسە نزیکەکان و باشە کان لە دەست دەدرێت ، بەڵێ لەوانەیە رزق و رۆزی بە درۆ کردن زۆر بێت ، بەلام دلنیابە بە شتی تر دەبێ قەرەبووی بکەیتەوە ، چ جای لە رۆژی قیامەتدا سزای درۆزن زۆر سەختە دۆلێکی بۆ دانراوە ، بۆیە مرۆڤی درۆزن چاوەرێ هەموو شتێکی خراپی لێ دەکرێت، واتە: درۆ کردن کلیلی هەموو خراپەکاریەکە ..؟!

# تاوانی درۆ هەلبەستن و بوختان کردن

تاوانی (الإفتراء والبهتان ) واته :درۆ هەلبەستن و بوختان كردن ، بەرانبەر كەسێك كه بێ تاوان بێت ، ئەمه یەكێكه له گوناهه گەورەكان ، ئەگەر ئەو كەسی ئەم تاوانه دەكات ئەوا توبەی لەسەر نەكات پەنا بە خوا ، دەچێته نێو ئاگری دۆزەخەوە ، چونكه ستەمێكی زۆر گەورەیە ..؟!

پێشەوا (العسكری ) — رحمەتی خوای لێ بێت — دەلێت : (الإفتراء ) بریتیه له درۆ هەلبەستن بۆ كەسێكی تر ..؟!

پێشەوا (السیوطي ) — رەحمەتی خوا لێ بێت — دەلێت: (الإفتراء ) بریتیه له دروست كردنی كێشە و بابەتێك كه ئەصل و ئەساسی نیه ، واته : ئەم كێشه یه هەر رووینەداوە بێ بنەمایه خۆی دروستی دەكات ، بۆ كەسی ئەو درۆیەی بۆ هەلبەستووە ..؟!

پێشەوا (الكوفی ) — رەحمەتی خوا لێ بێت — دەلێت : (الإفتراء) بریتیه له درۆیەكی زۆر گەورە و مەزن ، واته : درۆ هەلبەستنێكی زۆر گەورە مەزن بۆ كەسێ ..؟!

ووتراوە : ووشەی (البهتان ) واته: بوختان بریتیه لەو دۆریەی كه گوێگر سەرسورمان دەكات..؟!

پێشەوا (القرطبي ) — رەحمەتی خوای لێ بێت — دەلێت : (البهتان ) بریتیه له وەی كه تاوانێك بدرێته پال كەسێك له كاتێكدا كەسه كه لێ بێ بەریە و كەسێكی پاك و بێ تاوانه لێ ،" واته : تاوانێك بدرێته پال كەسێك كه لەئەصلدا هیچ بنەمایەكی راستی نیه،بەلكو سەرتاپەی درۆیه"..؟!

چەند بەلگەیەك لە قورئانی پیرۆز دەربارەی قەدەغە كردن و زەم كردنی تاوانی بوختان و درۆ هەلبەستن :

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ٦٨﴾ [العَنكَبُوت : ٦٨] واته: [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] وە كێ زاڵمترە؟ واتە: هیچ كەسێك لەو كەسە ستەمكارتر نیە كە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستێ كە ئەڵێ: خوا شەریكی هەیە [ أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ ] یان ئەو حەقەی كە خوای گەورە ناردوویەتی و پێی گەیشتووە ئەو بەدرۆی ئەزانێ [ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ ] ئایا جەهەننەم شوێنی مانەوەی هەمیشەیی كافران نیە (واتە: تەنها دۆزەخ شوێنیانە)..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ٤﴾ [الفُرۡقَان : ٤] واته: [ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ ] وە كافران ئەڵێن: ئەم قورئانە فەرموودەی خوا نیەو درۆیەكەو محمد - صلى الله عليه وسلم - هەڵیبەستووە [ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ ] وە كەسانێكی تر یارمەتیان داوە، واتە: جوولەكەو گاور یارمەتیان داوە لەسەر دانانی ئەم قورئانە [ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا ] وە بە دڵنیایی ئەم قسەیەی ئەمان ئەیكەن ستەم و درۆیەو هیچ حەقیقەت و ڕاستیەكی نیە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ٥٨﴾ [الأَحۡزَاب : ٥٨] واته: [ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا ] وە ئەو كەسانەی كە ئازاری باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت ئەدەن بە شتێك كە خۆیان ئەنجامیان نەداوە، واتە: بوهتانیان بۆ ئەكەن [ فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا ] بەڕاستی ئەمە بوهتانیان بۆ كردوون و درۆیان بۆ هەڵبەستوون و تاوانێكی زۆر ئاشكرایان كردووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢﴾ [الـمُمْتَحنَة : ١٢] واتە: [ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا ] ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەگەر ئافرەتانێکی باوەڕدار کۆچیان کردو هاتن بۆ لای تۆ وە بەیعەتیان پێدایت لەسەر ئەوەی کە هیچ جۆرە شەریکێك بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن نە گەورە نە بچووك [ وَلَا يَسْرِقْنَ ] وە دزی نەکەن [ وَلَا يَزْنِينَ ] وە زینا نەکەن [ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ ] وە منداڵەکانیان نەکوژن وەکو لە سەردەمی نەزانی هەندێك هۆزو عەشیرەت کچیان زیندە بەچاڵ ئەکرد [ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ ] وە بوهتانیش نەکەن بەوەی کە منداڵی جگە لە خۆیان بدەنە پاڵ خۆیان، بە زینا کردن بێ یان بە منداڵ دۆزینەوە بێ، یاخود هەبووە کچی بووە کچەکەی گۆڕیوەتەوە بە کوڕێك، ئاوا بوهتان مەکەن کە بڵێن ئەمە منداڵی ئێمەیەو لە خۆتان نەبێ [ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ ] وە لە چاکەیشدا سەرپێچی تۆ نەکەن وەك ئەوەی کە لە خۆیان نەدەن و قژ نەڕنن و یەخە دانەدڕن و دوعا لە خۆیان نەکەن لە کاتی بە لاو موسیبەت، ئەگەر هاتن لەسەر ئەم شتانە بەیعەتیان دا ئەی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - تۆ بەیعەتیان پێ بدە وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە خوای گەورە، عائیشە دەفەرمێت: (سوێند بە خوای گەورە هەرگیز پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەستی بەر دەستی ئافرەتێك نەکەوتووە لە بەیعەتداندا، بەڵکو تەنها بە قسە بەیعەتی لێوەردەگردن)، وە ئافرەتان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - تەوقەمان لەگەڵ ناکەیت؟ فەرمووی: (نەخێر من تەوقە لەگەڵ ئافرەتاندا ناکەم) [ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و زۆر بەبەزە ییە..؟!

چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا دەربارەی تاوانی بوختان و درۆ هەلبەستین

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( گەورەترین بوختان و درۆ هەلبەستن ئەوەیە کە سێك خۆی بداتە پال پیاوێك کە باوکی ئەو نەبێت " یان بلێت : خەونێکم بینیوە لە کاتێکدا ئەم خەونەی نەیبینیوە " یان شتێك بداتەپال پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەو نەی فەرموو بێت ).[10]

لە (دایکە عائیشە ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( گەورەترین تاوانی بوختان ئەوە کە دوو جۆر لە خەلکی ئەنجامی دەدەن : یەکیان شاعێرێکە بە شیعرەکەی قسەی خراپ بە گشت هۆزێك دەلیّ بەبیّ جیاوازی " ئەوە ئەوەی تریان پیاوێکە خۆی دەداتە پال پیاوێکی تر و دەلێت ئەو باوکی منە ).[11]

لە (ابو هریرە ) – خوا لیّ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَتَدْرُونَ ما الغِيبَةُ؟ قالوا: اللَّهُ ورَسولُهُ أعْلَمُ، قالَ: ذِكْرُكَ أخاكَ بما يَكْرَهُ. قيلَ: أفَرَأَيْتَ إنْ كانَ فِي أخِي ما أقُولُ؟ قالَ: إنْ كانَ فيه ما تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ ، وإنْ لَمْ يَكُنْ فيه فقَدْ بَهَتَّهُ )).[12] واتە: ئایا دەزانن غەیبەت چی یە ..؟! فەرمووی : باسی براکەت بکەی ئەوەی کە پێی ناخۆشە ..!! ووترا : ئەگەر ئەوەی کە من دەیلێم لە براکەم دا هەبوو ..؟! فەرمووی : ئەگەر ئەوەی تێدا بوو کە دەیلێی ، ئەوا غەیبەتت کردووە ، وە ئەگەر تێدا نەبوو ئەوا بوختانت کردووە ..؟!

لە (معاذ بن أنس ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : ((مَن حَمى مُؤمِنًا مِن مُنافِقٍ -أراه قالَ: بَعَثَ اللهُ مَلَكًا يَحمي لَحمَه يَوْمَ القيامةِ مِن نارِ جَهَنَّمَ، ومَن رَمى مُسلِمًا بشيءٍ يُريدُ شَيْنَه حَبَسَه اللهُ على جِسْرِ جَهَنَّمَ حتَّى يَخرُجَ ممَّا قالَ)) .[13] واتە: هەر کەسیّ موسلمانیّ لە زمانی دوو روویی یان منافق بپارێزی ، ئەوا (خوای گەورە) لە رۆژی قیامەتدا فریشتەیەك دەنێریّ جەستەی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزیّ ، هەر کەسیّ درۆیی بۆ موسلمانیّ هەلبەستێت بۆ ئەوەی لکەدار و عیبداری بکات ، ئەوا (خوای گەورە ) لە سەر پردی سەرات یان پردی دۆزەخ رادەگریّ هەتاکو رزگاری دەبێت لەو قسەیەی کە بە براکەی کردوویەتی ..؟!

[10]-صحيح البخاري .
[11]-صحيح الجامع .
[12]-صحيح مسلم برقم (٢٥٨٩).

ووتەی پێشینە چاکەکان لەسەر تاوانی بوختان و درۆ هەلبەستن :

لە (عبدالله کوری عمر ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : بوختان ئەوەیە کە شتێك بدیتە پال براکەت کە تیادا نەبێت ..؟!

لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : غەیبەت ئەوەیە بەشتێك باسی براکەت بکەی کە دەزانی ئەو شتە تیایەتی " وە ئەگەر وانەبێت ئەوکاتە دەبێت بە بوختان ..؟!

لە ( فضیل )– رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : لە کۆتایی ئاخر زەمان کە سانێك پەیدا دەبن بوختان چێن یان درۆ بۆ خەلکی هەلدە بەستن " لێیان ئاگادار بن ئەوان خراپترین دورست کراون" رووناکی ئیسلام لە ناو دلە کانیاندا نیە و کەسانێکی زۆر خراپن ..؟!

لە (سهیلی کوری عبدالله ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : هەر کەسێك سەلامەت بێت لە تاوانی غەیبەت کردن ، ئەوا سەلامەتە لە تاوانی درۆ کردن " وە هەر کەسێك سەلامەت بێت لە تاوانی درۆ کردن ئەوا سەلامەتە لە تاوانی بوختان کردن و درۆ هەلبەستن ..؟!

# زیانەکانی بوختان کردن و درۆ هەلبەستن

١-کەسی بوختانچی یان درۆ هەلبەستکار ، ستەمکارترین وخراپەکارترین کەسە " هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٩٤﴾ [آل عِمۡرَان : ٩٤] واتە: هەر کەسێ درۆ بۆ خوای گەورە هەڵبەستێ لەدوای ئەوەی کە تەورات بێنن و بیخوێننەوە ئەو ئەو کەسانە زاڵم و ستەمکارن ..؟!

٢-بوختان کردن و درۆ هەلبەستن سیفاتی کەسانێك کە ئیمانی نیە و بێ باوەرە " هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ۝١٠٥﴾ [النَّحۡل : ١٠٥] واتە: تەنها ئەو کەسانە درۆ هەڵئەبەستن کە ئیمانیان بە ئایەتەکانی خوای گەورە نیە لە کافران و بێباوەڕان [ وَأُولَئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ ] وە ئەو کەسانە خۆیان درۆزنن..؟!

٣-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆکارێکە بۆ تووش بوون بە تاوانی گەورە تر ئەویش هاوبەشی و شرکە ..؟!

لە پێشەوا (ابن تیمیە ) - رەحمەتی خوا لێ بێت - دەلێت : شرك یان هاوبەشی دانان ، وە باقی بیدعەو داهێنراوەکان بنچینە و بناغەیان کە بوختان و درۆ هەلبەستنە، بۆیە گشت ئەوانەی لە سەر توحید و یەکتاپەرستی و سوننەتن لەم تاوانە گەورەیە بە دوورن " وە ئەوانەی شریك و بیدعەن لەم تاوانە گەورەیە نزیکن ..؟!

٤-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆکاری شکت و هیلاکی و ریسوایی و زەلیلیە..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ۝١٣﴾ [العَنكَبُوت : ١٣] واتە: [ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ ] وە بەدڵنیایی ئەوان باری قورسی تاوانی سەرشانی خۆیان هەڵئەگرن [ وَأَثْقَالًا مَعَ أَثْقَالِهِمْ ] وە تاوانی ئەو کەسانەیش هە ڵئەگرن کە ئەمان گومڕایان کردوون و لە ڕێگای ڕاست دەریان کردون بەبێ ئەوەی کە تاوان لەسەر ئەوان لاچێ و لە تاوانیان کەم بکات (ئەوانەی بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ کوفرو بیدعەو تاوان و خەڵکی شوێنیان دەکەوێت ئەوا تاوانی خۆیان و خەڵکیش هەڵدەگرت بەبێ ئەوەی لە تاوانی خەڵکی

كەم بكات) [ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ] وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەدڵنیایی پرسیاریان لێ ئەكرێ لەو درۆیانەی كە هەڵیانبەستووە لە دونیادا..؟!

٥- بوختان و درۆ هەلبەستن هۆكاری بیّ بەش بوونە لە هیدایەت و ریّنموویی ..؟!

٦-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆكاریّكە بۆ لەدەستدانی بەختەوەری و شكۆ و عزەت سەرفرازی لە دونیاو لە قیامەتدا ..؟!

٧-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆكاریّكە بۆ تووشبوونی سزای دونیاو لیّ پرسینەوە و سزای قیامەت ..؟!

٨-بوختان درۆ هەلبەستن هۆكاریّكە بۆ هەموو خراپەكاریەك و نەهامەتیەك كە تووشی خاوەنەكەی دەبیّت ..؟!

٩-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆكاری ناخۆشیەكانی گیان كیّشان و كۆتا شەری خراپەیە ..؟!

١٠-بوختان و درۆ هەلبەستن هۆكاری تووش بوونە بە نەفرەت یان لەعنەت و توورەیی (خوای گەورە ) هەروەها ریسوایی و زەلیلی لە ژیانی دونیا دەچیژن هەر بەم جۆرەیە سزای ئەو بوختان و درۆ هەلبەستنەیان دەدەن ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ١٥٢﴾ [الأَعۡرَاف : ١٥٢] واتە: {خوای گەورە غەزەب لە گوێرەكەپەرستان دەگرێت} [ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ ] ئەو كەسانەی كە ئەو گوێلكەیان كرد بەخوای خۆیان و پەرستیان [ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّهِمْ ] ئەمانە بە دڵنیایی تووڕە بوونی خوای گەورە ئەیانگرێتەوە وەكو لە سوورەتی (بەقەرە) باسمان كرد كە خوای گەورە فەرمانی كرد یەكتری بكوژن [ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ] وە لە دونیاشدا خوای گەورە زەلیلیان ئەكات، (سوفیانی كوڕی عویەینە) دەفەرمێت: هەموو بیدعەچیەك زەلیلە [ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ (١٥٢) ] وە بەم شێوازە سزای ئەو كەسانە ئەدەین كە بوهتان ئەكەن وە درۆ هەڵئەبەستن و شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار ئەدەن..؟!

## تووڕەیی (خوای گەورە ) لە درۆ زنان لە قورئانی پیرۆزدا

بێ گومان لە قورئانی پیرۆز ئەو کەسانە بێهودە و بێ هیوا دەکات بە وەسف سیفەتانەی باسیان دەکات ، وەسف کردنی هەلگری گەورەترین مانای ناشرینن و قبیح و قێزەونن ..؟!

یەکەم : پەیوەندی نێوان درۆ کردن بێ باوەری ، نفاق یان دوو رووی ، ستەم کردن ، خۆ بەگەورە زانین :

ئەم وەسفە ناشرینانەش کە دەربارەی درۆ کردن لە قورئاندا هاتووە ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان درۆ کردن و بێ باوەری یان کوفر ، وە نیفاق یان دوو رووی ، هەروەها درۆکردن ستەم کردن ، وە درۆ کردن خۆ بەگەورە زانین ،ئەمانەی کە باسمان کرد پەیوەندی توندو تۆلیان هەیە بەدرۆ کردنەوە ، چونکەوەئەم چوار وەسفە یان سیفاتەی کەهەن هەلگری گەورەترین تاوانی درۆن ..؟!

١–پەیوەندی نێوان درۆ کردن و بێ باوەری یان کوفر :

بەلێ ( خوای گەورە ) بەراوردی نێوانی درۆ کردن و کوفر یان بێ باوەری کردووە ، وە پێچەوانەی حەق و رەوایە ، چونکە درۆ کردن پەیوەندی بە کوفر یان بێ باوەریەوە هەیە ،لە چەند ئایەتێکدا دەربارەیان باسی کردووە ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [الانشِقَاق : ٢٢] واتە : بەڵکو کافران سروشتیان وایە بەردەوام ئەوان ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەو ئەو شتانە بەدرۆ ئەزانن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ﴿١٩﴾﴾ [البُرُوج : ١٩] واتە: بەڵکو کافرانی قوڕەیش و سەرجەم کافران بەردەوام و هەمیشە لە بەدرۆزانین و گومان و کوفردان..؟!

بێ گومان لەم دوو ئایەتەی باسکرا کە درۆ کردن پەیوەندی بە ئیمان و باوەرەوە هەیە ..؟!

لەم ئایەتەدا (خوای گەورە ) درۆ کردن و بێ باوەری کۆ کردۆتەوە هەردوو کیان لە دۆزەخن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩] واتە: [ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] بەڵام ئەوانەی کە کوفریان کردووە وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیووە [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە..؟!

لەم ئایەتەدا (خوای گەورە ) باس لە بێ باوەران دەکات کە ئینکاری یەك خوایەتی دەکەن ، وە ئەوانەن کە ئایەتەکانی قورئان درۆ زانیوە و ئینکاریان لێ کردووە ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١٠﴾ [المَائـِدَة : ١٠] واتە: [ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] وە ئەوانەی کوفریان کردووە وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ] ئەمانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و ئەخرێنە دۆزەخەوە بەهەمیشەیی..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٥٧﴾ [الحَج : ٥٧] واتە : وە ئەو کەسانەی کە کافر بوونەو ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە ئا ئەوانە سزایەکیان بۆ هەیە کە لەناو ئەو سزایە خوای گەورە ڕیسواو ئیهانەیان ئەکات..؟!

لەم ئایەتەدا درۆزان ئەوانە باوەری بە (خوای گەورە ) ناکەن ، وە باوەر ناکەن بەم ئایەتانەی بۆ پێغەمبەران هاتووە ، وە باوەر بە رۆژی زیندوو بوونەوە ناکەن دوایی مردن ، سزا بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دونیادا درۆیان دەکرد ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ١٦﴾ [الرُّوم : ١٦] واتە : [ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا ] بەڵام ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕ بوونە بەخوای گەورە [ وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیووە [ وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ ] وە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەو گەیشتن بە رۆژی دوایی نەبووە [ فَأُولَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ (١٦) ] ئا ئەمانە لەناو سزای ئاگری دۆزەخدا ئامادەن و دەمێننەوە..؟!

**٢–پەیوەندی نێوان درۆ کردن و نیفاق یان دوو روویی :**

**لە ئایەتە باس لە درۆ کردنی منافق یان دوو رووە عەرەبە دەشتەکیەکان دەکات کە پرو بیانوویان دەدۆزیەوە عوزری درۆ یان دەهێناوە ، بە ئاشکرا درۆیان دەکرد لە گەل (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، پاشان بانگەشە ئیمان و باوەریان بۆ خۆیان دەکرد کەچی لە ناخەوە درۆیان دەکرد و دوو روو بوون..؟!**

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٩٠﴾ [التَّوْبَة : ٩٠]
واتە : [ وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ ] ئەو کەسانەی کە عوزریان نەبوو عوزری درۆیینە یان هێنابۆوە لە ئەعراب و دەشتنشینەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - تا ئیزنیان بدات بۆ ئەوەی ئەوانیش دوا بکەون و نەیەن بۆ غەزاو جیهاد، یاخود (ئیبنو عەبباس) بە سکون [ الْمُعْذِرُونَ ] خوێندویەتیەوە واتە: ئەوانەی عوزریان هەبوو هاتن داوای ئیزنیان کرد [ وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ] وە کەسانێکی تر کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا نەبوو - صلى الله عليه وسلم - ئەوانیش دانیشتن و نەهاتن بۆ جیهاد، یان نەهاتن داوای ئیزن بکەن [ سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ] ئەو کەسانەی کە کافرن خوای گەورە تووشی سزایەکی زۆر بەئێش و ئازاریان ئەکات لەوانەی کە عوزری درۆیینەیان هێناوەتەوەو باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەبووە..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) پێ ڕاگەیاندووین کە پەیمان یان وعدو بەلێن نەبردنەسەر یان شکاند ، وە درۆ کردن لە گەل وعدو بەلێندا ، ئەوا هۆکاری سەرەکیە بۆ نیفاق و دوو روویی ..؟!**

(خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ٧٧﴾ [التَّوْبَة : ٧٧] واتە: [ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ ] لەسەر مونافیقان دابەزیوە ئەوان بوونە کە بەهۆی نەبەخشین و ڕەزیلیان و بەڵێن نەبردنە سەریان لەگەڵ خوای گەورە خوای گەورە زیاتر تووشی نیفاق کردن و نیفاق خستە دڵیانەوە تا ڕۆژی قیامەت کە ئەگەن بە خوای گەورە [ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ ] بەهۆی ئەو وەعدانەی کە لەگەڵ خوای گەورە نەیانبردە سەر [ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ] وە بەهۆی ئەوەی کە درۆیان ئەکرد..؟!

لە (ابو هريره ) — خوا لێ رازی بێت — دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ )) [١٤] واتە : نیشانەی مونافیق یان دوو روو سیانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات ، ئەگەر بەلێنیدا نەیباتەسەر ، ئەگەر ئەمانەت یان سپاردەیەکی لا دانرا خیانەت و ناپاکی لێ بکات ..؟!

مەبەست لەم فەرموودەیە هەر وەك زانایان کۆ دەنگیان لەسەر مەبەست پێ (نفاق العمل ، وليس نفاق اعتقادی ) واتە : نیفاقی کردەوەیە نەك نیفاقی بیرو باوە ..؟!

بەردەوام دوو رووەکان ئەمە کارو پیشەیان بووە، نە لەگەل بێ باوەران بوونە ، وەنە لەگەل ئیمانداران ، چونکە ئەوان بەرژەوەندیان لە کوێی بووە ئەوا خۆیان بۆ دەردەخستن ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٤﴾ [المُجَادلَة : ١٤] واتە : {جولەکە خوا غەزەبی لێگرتوون} [ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئایا نابینی کەسانێك کە مونافیقانن خۆشەویستی و دۆستایەتیان بۆ کەسانێك هەیە کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون کە جوولەکەن، واتە: مونافیق دۆستایەتیان بۆ جوولەکە هەیە کە مونافیقان نە لەگەڵ ئێوەدان وە نە لەگەڵ ئەوانیشدان [ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ] پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لەگەڵ چەند موسڵمانێك لە سێبەری ژوورێك لە ژوورەکانی دانیشتبوو، فەرمووی: ئێستا کەسێك دێت بۆ لاتان بە چاوی شەیتان تەماشا دەکات، کە هات قسەی لەگەڵ مەکەن، پیاوێکی شین هات پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بانگی کردو پێی فەرموو: بۆچی تۆو فڵان و فڵان جوێن و تانەو تەشەرم لێدەدەن؟ ناوی چەند کەسێکی هێنا، ئەم پیاوە رۆیشت بانگی کردن ئەوانیش سوێندیان خواردو داوای لێبوردنیان کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: وە بەدرۆ سوێند ئەخۆن و خۆیشیان ئەزانن کە درۆ ئەکەن..؟!

---

[١٤]-صحيح مسلم برقم (٥٩) .

**دورست کردنی مەزگەوتی (زیرار ) لە لایەن مونافیقەکان بۆ زیان گەیاندن بە موسلمانان بوو ..؟!**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾﴾ [التَّوْبَة : ١٠٧] واتە : {مزگەوتی (زیرار) بۆ زیان گەیاندن بە موسڵمانان دروست کرا} [وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا ] وە ئەو کەسانەی کە مزگەوتی (ضیرار)یان دروست کرد کۆمەڵێك لە مونافیقان کە مزگەوتێکیان دروست کرد بەبیانوی ئەوەی وتیان ئێمە بۆ ئەوەمانە لە شەوی سەرماو باراندا خەڵکی لاوازو نەخۆش ناتوانن بێن بگەن بە مزگەوتی (قوبا) یان مزگەوتی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئێمە ئەم مزگەوتە بۆ ئەم مەبەستە دروست ئەکەین، بەڵام لە حەقیقەتدا بۆ زەرەرو زیان گەیاندن بە موسڵمانان دروستیان کرد، وە بەهۆی کوفر کردنیان بە خوای گەورە [وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ ] وە بۆ تەفرەقەو جیاوازی و ناکۆکی خستنە نێوان موسڵمانانەوە [ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ ] وە بۆ ئەوەی ببێتە پەناگەو کەمینێك بۆ ئەو کەسانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوایان کرد- صلى الله عليه وسلم - لە پێشترداو هەموویان لەوێ تیایدا کۆببنەوە، پیاوێك ناوی (ئەبو عامری راهب) بوو لە پێش ئیسلام ببو بەگاور لەناو خەزرەج ناودار بوو کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - هاتە مەدینە ئەم رای کرد بۆ مەککەو کافرانی هاندا بۆ جەنگ و دژایەتی موسڵمانان و دواتریش چوو بۆ لای هرقل پاشای رۆم و هەواڵی بۆ مونافیقانی مەدینە نارد مزگەوتێك دروست بکەن من سوپا دێنمە سەر مەدینە تا ببێتە پەناگە بۆمان، ئەوانیش دروستیان کردو داوایان کرد پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نوێژی تیا بکات بۆ شەرعیەت دان پێی، بەڵام پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی دەڕۆین بۆ غەزا (إن شاء الله) کە گەڕاینەوە نوێژی تیا دەکەم، کە گەڕایەوە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاندو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - چەند کەسێکی نارد رووخاندیان و سوتاندیان [ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَى ] وە دواتریش سوێند ئەخۆن کە ئێمە تەنها مەبەستمان چاکە بووە لەگەڵ موسڵمانان و مزگەوتێکمان بۆ دروست کردووە [ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٠٧) ] وە خوای گەورە شایەتە کە ئەوان درۆ ئەکەن..؟!

**(خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادار کردۆتەوە لەوەی کە مونافیقەکان درۆزنن ..؟!**

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾﴾ [المُنَافِقُون : ١] واتە: هەندێك لە سیفاتی مونافیقان [ إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - کاتێك کە مونافیقان دێن بۆ لات و ئامادەی مەجلیست ئەبن ئەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئێمە شایەتی ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت - صلى الله عليه وسلم - [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ ] وە خوای گەورە ئەزانێ کە تۆ بە ڕاستی پێغەمبەرو - صلى الله عليه وسلم - نێردراوی خوای گەورەی [ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ ] وە خوای گەورە بەدڵنیایی شایەتی ئەدات کە مونافیقان لەم قسە کردنەیان درۆ ئەکەن کە ئەڵێن: ئێمە لە دڵەوە شایەتی ئەدە ین کە تۆ پێغەمبەری خوای گەورەی - صلى الله عليه وسلم -..؟!

٣-پەیوەندی نێوان درۆ کردن و زولم و ستەمکردن :

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢١﴾﴾ [الْأَنْعَام : ٢١] واتە : [وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ ] کێ هەیە لەو کەسە ستەمکار تر، واتە: کەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە درۆ هە لْئەبەستێ بۆ خوای گەورە یان ئایەتەکانی قورئان یان موعجیزەکان بەدرۆ ئەزانێ [ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ (٢١) ] بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو زاڵمانە سەرفراز ناکات و تۆڵەو ئینتیقامیان لێئەسەنێت..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾﴾ [العَنكَبُوت : ٦٨] واتە: [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] وە کێ زاڵمترە؟ واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستێ کە ئەڵێ: خوا شەریکی هەیە [ أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ ] یان ئەو حەقەی کە خوای گەورە ناردوویەتی و پێی گەیشتووە ئەو بەدرۆی ئەزانێ [ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ (٦٨) ] ئایا جەهەننەم شوێنی مانەوەی هەمیشەیی کافران نیە (واتە: تەنها دۆزەخ شوێنیانە)..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ [هُود : ١٨] واتە: [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] کێ هەیە زاڵمتر واتە: هیچ کەسێك ستەمکارتر نیە لەو کەسانەی کە درۆ هەڵئەبەستن بۆ خوای گەورەو بەناو خوای گەورەوە قسە ئەکەن [ أُولَئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّهِمْ ] ئا ئەمانە رووبەڕووی خوای گەورە ئەکرێنەوە لە ڕۆژی قیامەت و خوای گەورە موحاسەبەیان دەکات [ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ ] وە هەموو شایەتەکان لە مەلائیکەت و پێغەمبەران و زانایان ئەڵێن: ئا ئەمانە بوون کە لە دونیادا درۆیان بۆ خوای گەورە هەڵئەبەست و درۆیان ئەدایە پاڵ خوای گەورەو ئەیانووت: مەلائیکەت کچی خوایە، یان عیسى کوڕی خوایە، یان ئەمانە تکامان بۆ ئەکەن لای خوای گەورە [ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ] دەی نەفرەت و لەعنەتی خوای گەورە لە ستەمکاران بێ ئەوانەی کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستن و بەناوی خوای گەورەوە قسە ئەکەن و درۆ ئەدەنە پاڵ دینەکەی خوای گەورە..؟!

٤–پەيوەندى نێوان درۆ كردن و خۆ بە گەورە زانين :

بێ گومان (خواى گەورە ) لە چەندين ئايەتدا تاوانى خۆ بەگەورە زانينى باسكردووە ، وە خۆ بە گەورە زانين و لووتبەرزى يەكێكە لە تاوانە هەر گەورەكان ، بەلام لە چەند ئايەتێكيش هاتووە كە درۆ كردن خۆ بە گەورە زانێن پەيوەنديان لە نێواندا هەيە بەيەكەوە باسى كردووە ..؟!

(خواى گەورە) دەفەرموويێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَـٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ٣٦﴾ [الأَعۡرَاف : ٣٦] واتە: [ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا ] وە ئەو كەسانەيشى كە ئايەتەكانى ئێمەيان بەدرۆ زانيوە وە خۆيان بەگەورە زانيوە لە وە لامدانەوەى [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] ئا ئەمانە هاوەڵى دۆزەخن بە نەمرى و هەميشە يى تيايدا ئەمێننەوە بەهۆى كوفر كردنيان..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِى ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٤٠﴾ [الأَعۡرَاف : ٤٠] واتە: [ إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا ] خواى گەورە ئەفەرمووێ: ئەو كەسانەى كە ئايەتەكانى ئێمە بەدرۆ ئەزانن وە خۆيان بە گەورە ئەزانن و شوێنى ناكەون [ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ ] ئا ئەمانە دەرگاكانى ئاسمانيان بۆ ناكرێتەوە كاتێك كە ڕوحيان ئەكێشرێ بۆ ئەوەى ڕوحيان بەرز بكرێتەوە، ياخود دوعايان بەرز نابێتەوە، يان كردەوەيان بەرز نابێتەوە [ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ] وە ناچنە ناو بەهەشتەوە تا حوشتر نەچێتە ناو كونى دەرزييەوە، يان حەبلى ئەستور نەچێتە كونى دەرزييەوە، كە ئەمە شتێكى ئەستەمە [ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ] وە بەم شێوازە ئێمە سزاى تاوانباران ئەدەينەوە..؟!

## دوو روویی یان نیفاق پەیوەندی بە درۆ کردن

بەلێ نیفاق دوو روویی بریتیە لەوەی کە سەکە  بە روالەت خۆی بە موسلمان بزانێت بەلام لە ناخی دا باوەری بە ئیسلام نەبێت ، هەر بۆیە کەسی دوو روو بەردەوام لە فێل و تەلەکە و گۆرانکاری دا دەژی لە روالەتدا  لەگەل حەق و راستیە بەلام بەردەوام درۆ دەکات لەحەق و راستیداخۆی لادەدات لە ناخی دا ، بۆیە هەمشە درۆ دەکات بێ بەلێن و دزو ناپاکە، ئەفەرموودەیە بە روونی کەسی مونافق پێ دەناسێنێ ، زۆر بە جوانی ئاشکرایان دەکات بۆ خەلك.

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ )) [١٥] واتە : نیشانەی مونافیق یان دوو روو سیانە :  ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات ، ئەگەر بەلێنیدا نەیباتەسەر ، ئەگەر ئەمانەت یان سپاردەیەکی لا دانرا خیانەت و ناپاکی لێ بکات ..؟!

بێ گومان نیفاق یان دوو رووی نەخۆشیەکی زۆر ترسناکە و زیانێکی یەکجار گەورەی هەیە لە نێو خەلك و کۆمەلگاو دولەت و بەر پرسانی ئەم ولاتە ، چونکە زۆر بەی خەلك بەدەستی نیفاق دوو روویەوە دەنالێنی ژیان و مال و حال وکارو پیشەکەی خۆی لە دەستداوە یان بژیوی ژیانی زۆر ئەستەم بووە ، هەروەها ترس دلەراوکێ ئازارو ئەشکەنجەی زۆر هەیە ئەمانە هەر هەمووی هۆکاری نیفاق دوو روویە لە نێو کۆمەلگا ، وە برسی کردنی خەلك نان برینی خەلك نەهامەتی ، هەروەها دەژایەتی کردنی ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام لە لایەن دوو رووەکانەوە ، وە بێ متمانەی و بێ بەلێنی و درۆ کردن ، دزی کردن و ناپاکی کردن لە بەرپرسیاریەت و ئەمانەت هەر هەمووی پیشە و کردەوەکانی مونافیقەکانە یان دوو رووەکانە ، لە رابردوو دا و لەم سەردەمەی ئێستا کە تیاداین ، بەلێ دیاردەی دووڕووی لە نێو خەلکدا دیاردەیەکی زۆر کوشندەیە ، هەموو کۆمەلگا بەدەستیەوە دەنالێنێت ، چونکە کاتێك کەسێك دەکەنە بەرپرس ، ئینجا ئەم  دوو روویی و نیفاقەی لێ روودەدات ، کە وەك درۆ کردن ، بێ بەلێنی ، دزی کردن و ناپاکی و خیانە لە ئەمانەت و ئەوسپاردەیەی کە پێ سپێردراوە ، بۆیە ئەوەی لەدوای ئەمەیش دێت پێی وایە ئەمە راستە دەبێت بەم خراپەکاری فسادە شوێنەکەی خۆی بپارێزی ، کەچی نازانێت نیفاق کردنە ..؟!

---

[١٥]-صحيح مسلم برقم (٥٩) .

# زيانى كوشندەيى نيفاق يان دوو رووى

١–كەسى مونافق يان دوو روو لە كافر خراپترە ، هەر بۆيە (خواى گەورە ) لە خوارەوەى دۆزەخ شوێنى بۆ دەست نيشان كردووە ، هەر وەك (خواى گەورە) دەفەرموويێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ [النِّسَاء : ١٤٥] واتە: [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ ] بەدڵنيايى مونافيقان لە خوارترين پلەى ئاگرى دۆزەخن، كە (دەرك) يان (دەرەكات) پلەيە بۆ خوارەوە بە پێچەوانەى (دەرەج) يان (دەرەجات) كە پلەيە بۆ سەرەوە، بۆيە بەهەشت (دەرەجاتى) هەيە پلەكانى بۆ سەرەوەيەو دۆزەخ (دەرەكاتى) هەيە پلەكانى بۆ خوارەوەيە، خوارترين پلەى ئاگرى دۆزەخ كە سەختترين سزايە بۆ مونافيقانە [ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا] وە نابينى كەس پشتيوانيان بێ وە ڕزگاريان بكات لە ئاگرى دۆزەخ..؟!

٢–كەسى مونافق يان دوو روو بەردەوام لە فێل تەلەكەو گۆرانى راستيەكانە ، لە روالەت دا لە گەل حەق راستيە بەلام پێچەوانەكەيەتى ، هەر وەك (خواى گەورە) دەفەرموويێت : قال تعالى: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾﴾ [النِّسَاء : ١٤٣] واتە: [ مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَلَا إِلَى هَؤُلَاءِ ] مونافيقان دوو دڵن لە نێوان موسڵمانان و لە نێوان موشريكاندا خۆيان يەكلا نەكردۆتەوە بۆ لاى هيچ كامێكيان نە بۆ لاى ئەمان خۆيان يەكلا كردۆتەوە نە بۆ لاى ئەوان، بەڵكو لە رووكەشدا لەگەڵ باوەڕدارانن و لە ناوەڕۆك و ناخدا لەگەڵ كافرانن [ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ] وەهەر كەسێكيش كە خواى گەورە گومڕاى بكات ئەوە هيچ ڕێگايەك نابينى كە بيگەيێنێ بەحەق ئەمانە خواى گەورە گومڕاى كردوون لەبەر ئەوەى حەقيان ناسى و شوێنى نەكەوتن شايەنى هيدايەت نين..؟!

٣–كەسى مونافق يان دوو روو لەبەر ناخ پيسيان زۆر دوورن لە ئاينى خوا ، هەر وەك (خواى گەورە ) دەفەرموويێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾﴾ [النِّسَاء : ٦١] واتە: [ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ ] وە كاتێك كە بانگيان بكەيت و پێيان بڵێيت وەرن بۆ لاى ئەو قورئانە پيرۆزەى كە خواى گەورە دايبەزاندوە وە وەرن بۆ لاى پێغەمبەرى خوا- صلى الله عليه وسلم - با حوكم و بڕيار لە نێوانتاندا بكات [ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا (٦١) ] ئەبينى مونافيقان پشتت تێ ئەكەن و ڕا ئەكەن لەوەى كە حوكم بێننەوە بۆ لاى قورئان و بۆ لاى پێغەمبەرى خوا- صلى الله عليه وسلم -.

بەلێ موونافق یان کەسی دوو روو  هەلس و کەوتە کەی لە گەل بە ژەوەندیەکانی دایە ، وە کاتێ دەگەن بە موسلمانان خۆشەویستی خۆیانیان بۆ دەردەبرن بە ئومێدی ئەوەی بەو هۆیەوە شتێکیان دەس کەوێن ..! ! لەو لاشەوە کاتێ دەگەن بە شەیتانە گەورەکانیان دەلێن ئێمە لەگەل ئێوەین لەو شیرك کوفرو  درۆ یە کە ئێوە پیادەی دەکەن ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ [البَقَرَةِ : ١٤ – ١٥] واتە: [ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا ] کاتێك کە ئەم موونافیقانە بگەیشتنیایە بە باوەڕداران (صەحابە) ئەیانووت: ئێمەش وەکو ئێوە ئیمانمان هێناوە [ وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ ] وە کاتێك تاك بوونایەتەوە لەگەڵ شەیتانەکانیان لەسەرانی کوفرو نیفاق و جولەکە [ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) ] ئەیانووت: ئێمە لەگەڵ ئێوەداین وەکاتێك کە ئێمە تێکەڵ موسڵمانان ئەبین ئەوە تەنها گاڵتەیان پێ ئەکەین..؟! [ اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ] دیسان خوای گەورە لەسەر صەحابە دێتە وەڵام کاتێك ئەوان گاڵتە بە صەحابە ئەکەن لەبەرامبەر ئەو گاڵتە پێکردنە خوای گەورەش گاڵتە بەوان ئەکات وە سووك و ڕیسوایان ئەکات و تۆڵەیان لێ ئەسەنێ بۆ بەندە باوەڕدارەکانی [ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ  ] وە بۆیان درێژ ئەکاتەوە لەناو توغیان گومڕایی و کوفری خۆیاندا بگەوزێن و بەردەوام بن چونکە شایەنی ئیمان نین..؟!

## سیفەتەکانی کەسی دوو روو یان مونافق

**١–خراپترین سیفەتی مونافقەکان یان دوو رووەکان بریتیە لە بێ باوەری یان کافر بوون بە (خوای گەورە) هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت:** قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] واته: [ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ ] ئەڵێن: ئایا ئێمە ئیمان بێنین هەروەکو چۆن ئەو کەسە سەفیهـ و گێل و نەزان و نەفام و کاڵفامانە ئیمانیان هێناوە (مەبەستیان صەحابەیە) (خوایان لێ رازی بێت) [ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ ] خوای گەورە لەسەر صەحابە دێتە وەڵام و ئەفەرمووێ: نەخێر ئەم مونافیقانە ئەمانە خۆیان گێل و نەزان و نەفامن بەڵام نازانن..؟!

**٢–یەکێکی تر لە سیفەتەکانیان بریتیە لە دوو ژمنایەتی و حسوودیی یان ئیرەیی بردن و دژایەتی کردن پێغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان یان باوەرداران ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّ هُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾﴾ [التَّوْبَة : ٥٠] واته : [ إِنْ تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئەگەر خوای گەورە تووشی خێرو چاکەیەکت بکات لە سەرکەوتن و غەنیمەت دەست کەوتن ئەوان پێیان ناخۆشەو خەفەتبار ئەبن [ وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ ] وە ئەگەر تووشی بەڵاو موسیبەتێك ببیت لە جەنگێکدا تێکبشکێیت [ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ ] ئەڵێن: ئێمە کاری خۆمان کردو پێشتر حسابی خۆمان کردو لەگەڵیاندا دەرنەچووین نەك وەکو ئەوان تووشی ئەو بەڵاو موسیبەتە ببین [ وَيَتَوَلَّوْا وَهُمْ فَرِحُونَ ] وە پشت هەڵئەکەن و ئەوان دڵخۆشن بەوەی کە موسڵمانان تێکشکاون و خۆیان پارێزراو بوونە..؟!

٣–هەروەها یەکێکی تر لە سیفاتەکانی مونافقەکان یان دوو رووەکان گالتە کرد بە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی و موسلمانان ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت: قال تعالی:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾﴾ [التَّوْبَة : ٦٥ – ٦٦] واته: {گاڵته کردن به خواو ئایەتەکانیو پێغەمبەرەکەی - صلی الله علیه وسلم - کوفره} [ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ] لە غەزای تەبووکدا کەسێك لە مونافیقان وتی: کەسم نەبینیوە وەکو پێغەمبەری خواو - صلی الله علیه وسلم - ئەم صەحابانە کە بەخەمی سکیانەوە بن، وە لە کاتی قسەکردندا درۆ بکەن، وە لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی دوژمن ترسنۆك بن، پیاوێك لە صەحابە فەرمووی: درۆت کرد بەڵکو تۆ مونافیقی ئەبێ هەواڵ بە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - بدەم، تا ئەو گەیشتە لای پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، وە کاتێك کە پرسیاریان لێ بکەی بۆچی ئەم قسانەتان کردووەو تانەو تەشەر لە پێغەمبەری خواو - صلی الله علیه وسلم - لە صەحابەو لە دین ئەدەن ئەو کاتە ئەڵێن ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - ڕێگا دوور بوو دەمەتەقێمان ئەکرد بۆ ئەوەی دووری ڕێگاکە ببڕین وە گاڵتەمان ئەکردو کاتمان بەسەر ئەبرد [ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ] ئەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - پێیان بفەرمە: ئایا ئێوە شت نەما گاڵتەی پێ بکەن ئیلا خوای گەورەو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەری خوا نەبێ - صلی الله علیه وسلم - ئایا ئێوە گاڵتە بەمانە ئەکەن..؟! [ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ] ئەو کەسە خۆی هەڵواسی بوو بە ڕەشمەی ئەسپەکەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - هەر ئەیوت: ئێمە گاڵتەمان ئەکردو کاتمان بەسەر ئەبرد، پێغەمبەریش - صلی الله علیه وسلم - ئەیفەرموو: عوزر مەهێننەوە ئەوە ئێوە کافر بوون، واتە: کوفرەکەتان ئاشکرا کرد لە دوای ئەوەی کە پێشتر ئیمانتان ئاشکرا کردبوو [ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ ] ئەگەر لە کۆمەڵێکیشتان خۆش بین ئەوانەی کە واز لە نیفاق دێنن و تەوبە ئەکەن [ نُعَذِّبْ طَائِفَةً ] ئەوا کۆمەڵێکتان سزا ئەدەین ئەوانەی کە بەردەوام بن لەسەر نیفاق و کوفری خۆیان [ بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ] لەبەر ئەوەی ئەمانە بەردەوامن لەسەر جەریمەو تاوان..؟!

**٤–هەروەها یەکێکی تر لە سیفەتەکانیان فسادی و گەندەلی بلاو کردنەوەیە لەسەر زەوی دا بە ئەنجام دانی بێ باوەری و کوفر و دوو رووی و تاوان ،دەیێن و دەلێن : ئێمە چاکسازیی دەکەین بەلام راست ناکەن و ئەوان سەر قافلەی گەندەلکارانن و تۆی خراپەکە کاری دەچێنن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١١ – ١٢] واتە: [ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ ] وە کاتێك کە پێیان بلێی ئاشوب مەگێڕن و ئاشوب مەنێنەوە لەسەر زەوی بە نیفاق و دووڕوویی و خۆشەویستی دەربڕین بۆ کافران و تاوانکردن [ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ] ئەڵێن: ئێمە تەنها چاکسازین..؟! [ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ] بزانن ئاشوبگێڕی تەواو ئەوان خۆیانن بەڵام هەست ناکەن [ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ ] وە کاتێك کە پێیان بڵێی ئیمان بێنن وەکو چۆن خەڵکی (واتە: صەحابە) ئیمانیان هێناوە..؟!

**٥–سیفەتێکی تر لە مونافقەکان یان دوو رووەکان ، ئەوەی کە دلّیان نەخۆشە ، (خوای گەورە) ئەو دلە یان زیاتر نەخۆش دەکات ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] واتە: [ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ] ئەمانە نەخۆشی شەك و گومان و نیفاق لە دڵیاندایە [ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ] خوای گەورەش ئەو نەخۆشییەیانی زیاتر کرد لەبەر ئەوەی حەقیان ناسی و لایاندا لێی و ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا نەهێنا صلى الله عليه وسلم [ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ] وە سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە بەهۆی ئەو درۆ کردنەی کە ئەیانکرد، بانگەشەی ئیمانیان دەکردو ئیمانداریش نەبوون..؟!

**٦–هەروەها یەکێکی تر لە سیفەتەکانیان دۆر کردن و بوختان و درۆ هەلبەستنە ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ٥٦﴾ [التَّوۡبَةِ : ٥٦] واتە: [ وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ ] وە مونافیقان سوێند ئەخۆن بە خوای گەورە کە ئەوان لە ئێوەن وە موسڵمانن [ وَمَا هُمْ مِنْكُمْ ] بەڵام درۆ ئەکەن ئەوان لە ئێوە نین و موسڵمان نین [ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ] بەڵام ئەوان کەسانێکن لە رووبەڕووبوونەوەی دوژمن ئەترسێن بۆیە لەگەڵتان نایەن بۆ غەزا، یاخود لە ئێوە ئەترسێن بۆیە سوێندتان بۆ ئەخۆن کە ئێمە لەگەڵ ئێوەداین..؟!

**٧-هەروەها سيفەتێكى تريش لە مونافيقە كان و دوو رووەكان ، فەرمانكردن بە خراپە و رێگرى كردنە لە چاكە كردن ، ئەوان هەميشە رەزيلن لە مال بەخشين ، هەر وەك (خواى گەورە) دفەرموويت :** قال تعالى: ﴿ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٦٧﴾ [التَّوۡبَة : ٦٧] واته: [ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ ] پیاوانى دووڕوو ئافرەتانى دووڕوو [ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ ] هەندێكيان دۆست و پشتيوانى هەندێكى تريانن [ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ ] فەرمان ئەكەن بە خراپەو ڕێگرى ئەكەن لە چاكە [ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ] وە دەستيان توونند ئەگرن و ڕەزيلن لە بەخشين [ نَسُوا اللَّهَ ] خواى گەورەيان لەبير كرد [ فَنَسِيَهُمْ ] خواى گەورەش وەكو لەبيرچوو مامەڵەيان لەگەڵدا دەكات و ئيهماليان دەكات، ئەگەرنا خواى گەورە هيچ شتێك لە بير ناكات [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ] بەڕاستى مونافيقان ئەوانن كە فاسقن و دەرچوون لە گوێڕايە ڵى خوا..؟!

**٨-هەروەها سيفەتێكى تر لە سيفەتەكانيان تەماحكردن و لە مالى خەلكى ، وە سوور بوونە لە سەر بەدەست هێنان مال ، هەروەك (خواى گەورە) دفەرموويت :** قال تعالى: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ٥٨﴾ [التَّوۡبَة : ٥٨]

واته: [ وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ ] پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - غەنيمەى غەزاى حونەينى دابەش دەكرد (عبدالله بن ذي الخويصرة التميمي) هات وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - دادپەروەر بە، پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرمووى: هاوار بۆ خۆت ئەگەر من دادپەروەر نەبم كێ دادپەروەرە؟! ئيمامى عومەر فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - ڕێگام بدە لە گەردنى بدەم، پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرمووى: لێيگەڕێ ئەمە هاوەڵانێكى هەيە يەكێك لە ئێوە نوێژى خۆى پێ كەمە لە ئاست نوێژى ئەمان، وە ڕۆژووى خۆى پێ كەمە لە ئاست ڕۆژووى ئەمان، لە دين دەردەچن هەروەكو چۆن تير لە نيشان دەردەچێت، لە هەر شوێنێك پێيان گەيشتن بيانكوژن، خواى گەورە ئەم ئايەتەى دابەزاند، وە دواتر كە دەركەوتن خەواريج بوون ئيمامى عەلى كوشتارى كردن، وە هەيشيانە ئەى محمد - صلى الله عليه وسلم - لەو مونافيقانە ڕەخنەو تانەو تەشەر لە تۆ ئەگرێ كاتێك كە صەدەقەو خێر ياخود غەنيمەت دابەش ئەكەى لە نێوان موسڵمانان [ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا ] ئەگەر پێيان ببەخشى ئەوەندەى كە خۆيان ئەيانەوێ ئەوا ڕازى ئەبن وە تانەو تەشەرت لێ نادەن لەبەر ئەوەى ئەوان نيەتيان دونيايە [ وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ] بەڵام ئەوەى كە مەبەستيانە نە ياندەيێ ئەو كاتە توورە ئەبن وە ناڕازى ئەبن وە تانەو تەشەرت لێ ئەدەن..؟!

**٩–هەروەها یەکێکی تر لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە قسە دەکات درۆ دەکات و بەلێنی نابەتەسەر یان ناپاکی و خیانەت دەکات ، وەیان کاتێ تووشی ناخۆشیەك دەبێت لە گە ل کەسێك ستەم دەکات و قسەی نەشیاو دەکات و سنوور دەبەزێنێت ، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی:**

**لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فيه كانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَن كَانَتْ فيه خَلَّةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَلَّةٌ مِن نِفَاقٍ حتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذَا عَاهَدَ غَدَرَ ، وإذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإذَا خَاصَمَ فَجَرَ . غَيْرَ أنَّ في حَديثِ سُفْيَانَ: وإنْ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ )) .[١٦]

**واتە: هەر کەسێك ئەم چوار خەسلەتە و سیفەتەی تێدا بێت ئەوا مونافقی حەقیقی تەواوە ، ئەوا هەر کەسیش یەکێکیانی تێدا بێت ئەوا سیفەتی مونافیقی یان دوو رووی تێدایە ، تاکو وازی لێ دەهێنێ ، کاتێ قسە دەکات درۆ دەکات ، وە کاتێ پەیمانێك دەدات یان بەلێنێ ئەوا نایباتەسەر و خیانەتی لێ دەکات ، وە ئەگەر وەعدی دەدات دەیشکێنێت ، وە کاتێ دژایەتی کەسێکی کرد و لە حەق لا بدات ستەمی لێ بکات ..؟!**

**١٠–هەروەها یەکێکی تر لە سیفاتەکانیان گرنگی دانە بەبریقەو رووکەش کردن و پشت گوێخستنی ناخەو رازانەوەی گوفتارە شیرینەکانیان ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموێت:** قال تعالی:

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ۝٥٨﴾ [التَّوۡبَة : ٥٨] واتە : {مونافیقان قسەزانن} [ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ] وە کاتێك کە ئە یانبینی سەرسام ئەبی بە لاشەو شێوازیان کە شێوازیان جوانە [ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ] وە ئەگەر قسەیش بکەن گوێ لە قسەکەیان ئەگری، واتە: سەرنجت ڕائەکێشن لەبەر زمان پاراوی و زمان لووسی و ڕەوانبێژییان وەکو (عبداللە¬ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)ی گەورەی مونافیقان [ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ ] بەڵام لە لاوازی و ترسنۆکیاندا وەك دارێکی کلۆرو ناوبۆش وان کە پاڵی دابێ بە دیوارێکەوەو خۆی ڕانەوەستێت، یان چۆن دارێك لە مەجلیسی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دابنێیت هیچ تێناگات ئەوانیش ئاوان { مونافیقان ترسنۆکن} [ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ] لە ترسنۆکیاندا هەموو دەنگێك یان شتێك روو بدات وائەزانن بۆ ئەوان هاتووەو دژی ئەوانە، یان ئایەتەکانی قورئان کە دائەبەزێ ئەزانن کە ئابڕووی ئەوان ئەبات [ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ ] ئەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دوژمنی ڕاستەقینە ئەمانەن ئاگاداریان بە [ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ] خوای گەورە بیانکوژێ و نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێت چۆن لە پاش ناسینی حەق لێی لائەدەن بۆ کوفر..؟!

[١٦]-صحيح مسلم برقم (٥٨).

# جۆرەکانی نیفاق یان دوو ڕوویی

## یەکەم : (نفاق إعتقادي ) واتە: دوو ڕوویی بیرو باوەر :

بریتیە لە دوو ڕوویی بیرو باوەر ، ئەم جۆرە نیفاقە پێ کافر و بێ باوەر دەبێت ، خاوەنەکەی لە ناو ئاگری دۆزەخ دایە لە ژێرەوە ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ [النِّسَاء : ١٤٥] واتە: [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ ] بەدڵنیایی مونافیقان لە خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخن، کە (دەرك) یان (دەرەکات) پلەیە بۆ خوارەوە بە پێچەوانەی (دەرەج) یان (دەرەجات) کە پلەیە بۆ سەرەوە، بۆیە بەهەشت (دەرەجاتی) هەیە پلەکانی بۆ سەرەوەیەو دۆزەخ (دەرەکاتی) هەیە پلەکانی بۆ خوارەوەیە، خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخ کە سەختترین سزایە بۆ مونافیقانە [ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا] وە نابینی کەس پشتیوانیان بێ وە ڕزگاریان بکات لە ئاگری دۆزەخ..؟!

## سیفەتەکانی (نفاق إعتقادي ) یان دوو ڕوویی بیرو باوەر :

١-بەدرۆ خستەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پەیامەکەی و لە هەندێك شت دا .

٢-رق و قینە لە پێغەمبەری خواﷺ وە لە هەندێك شت وەك ئەم شەریعەتەی کە پێ هاتووە.

٣- رق قینە و لە موسلمانان و شوێن کەوتوانی پێغەمبەر خوا ﷺ .

٤-دڵ خۆش بوون بە لاواز بوونی موسلمانان و شکستەکانی موسلمانان لە هەر شوێنێکدا .

٥-پێ ناخۆش بوون بە سەر کەوتنەکانی موسلمانان لە هەر شوێنێکدا.

٦-پشتگیر کردنی بێ باوەران وە جوولەکە و گاوەرەکان و مولحیدەکان ،بۆسەرکەوتنی ئەوانە.

٧-گاڵتە کردن بە موسلمانان و ئیمانداران ، لەبەر ئیمان هێنانیان و گوێ رایەڵی کردنیان بۆ (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ .

٧-پشت کردن لە حوکمی (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ .

**دووەم : (نفاق العملی ) واتە: دوو روویی کردەوە :**

بریتیە لەو جۆرە دوو رووە کە بە کردەوە ئەنجام دەدرێت ، هەلبەتە خاوەنەکەی پێ بێ باوەر نابێت ، بە لکو سزای خۆ دەکێشی لە ئاگری دۆزەخەوە ، کە ئەم سیفاتانەی خوارەوەیە یان وە ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ :

١-ئەگەر بەلێنیدا نایباتە سەر بەلێن و وعد دەکەی دەشکێنی .

٢-ئەگەر قسە بکات بەردەوام درۆ دەکات.

٣-ئەگەر ئەگەر ئەمانەتێك یان سپاردەیەکی پێ بسپێری خیانەت و ناپاکی لێ دەکات .

لە (ابو هریره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ )) [١٧] واتە : نیشانەی مونافیق یان دوو روو سیانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات ، ئەگەر بەلێنیدا نەیباتەسەر ، ئەگەر ئەمانەت یان سپاردەیەکی لا دانرا خیانەت و ناپاکی لێ بکات ..؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فيه كانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَن كَانَتْ فيه خَلَّةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَلَّةٌ مِن نِفَاقٍ حتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ . غيْرَ أنَّ فى حَديثِ سُفْيَانَ: وإنْ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ )) .[١٨]

لە(معاویە بن حیدە القشیری ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((ويلٌ للذى يحدِّثُ فيكذبُ لِيُضحكَ بِهِ القومَ، ويلٌ لهُ، ويلٌ لهُ)) . [١٩] واتە: تیاچوون ( یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەلك بهێنێتە پێکەنین ، تیاچوون (یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆی ، تیاچوون (یان دۆلێك لە دۆلەکانی دۆزەخ ) بۆ ی ..؟!

---

[١٧]-صحيح مسلم برقم (٥٩) .
[١٨]-صحيح مسلم برقم (٥٨).
[١٩]-سنن ابو داود برقم (٤٩٩٠).

# دەربارەی نیفاق یان دوو روویی لەم زەمانەدا

بەڵێ لە قورئانی پیرۆز و لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، باسی بنەماکانی سیفاتی دوو روو یان کردووە ، بە پێی ئەم بنەمایانە دوو روویی یان مونافق لە زەمانێك بۆ زەمانێك لە شوێنێك بۆ شوێنك دیکە " بە شێوازی جیاواز جیاواز دەر دەکەوێت ، وە دوو رووەکان یان مونافیقەکان بە رەفتارو گوفتاری خۆی بە پێی زەمان و شوێن ، دان بە دوو رووەکەی یان نیفاقەکەی دەنێت، ئیماندارانیش بە نوری ئیمانەکەیان دەیان ناسین ، بە سنووری شەرع حوکمی لەسەر نادات ، بەلام لەبەر ئەوەی زۆر لە ئیمانداران لەم ناسینە غافل و بێ ئاگان ، هەر بۆیە دەبێت باس لە رەفتارو گوفتارێکی نیفاق یان دوو رووی ئەم سەردەمە یان ئەم زەمانە بکەین ، وە موسلمانان لێ ئاگادار بکەینەوە ، ئەم خالانەی خوارەوە سیفات و رەفتارو گوفتاری دوو رووەکانن :

١-مونافیقەکان یان دوو رووەکان ئەم زەمانە " هەولدەدن موسلمانان وە کەسانی خراپەکارو تیرۆرست بناسێنن بە خەلك ، وە هەولدەدەن کردەوەکانی تیرۆرستان هاوشێوەی رەنگدانەوە قورئان و فەرموودە بزانرێن ..؟!

٢-دوو رووەکانی ئەم زەمانە" پێی خۆشە کەسێکی موسلمانان کارێکی خراپ بکات ، یان کارێکی تیرۆرستی بکات ، ئینجا ئەم کارە خراپەی ئەو کەسە پێشانی خەلك دەدات ، دەلێت ئەها ئەوەتە ئیسلام ئەم کارەی کردووە ، یان بانگەشەی بۆ دەکات بۆ هەموو دونیا ، وە دەی گەرێنێتەوە بۆ ئیسلام بە ئیسلامی دەلکێنی ، بەلام ئەگەر کەسێکی جگە لە ئیسلام یان وەك جوولەکە گاورەکان هەمان کاری تیرۆرستی یان خراپە بکات ، ئەوا خۆی لێ بێ دەنگ دەکات ، یان دەلێت : ئەوا نەخۆشی دەروونی هەیە یان پروبیانوویەکی بۆ دەدۆزێتەوە کە خۆشی باوەری پێی نیە ..؟!

٣-مونافقی یان دوو رووی ئەم زەمانە " زۆری پێ ناخۆشە ئەگەر رەخنە رۆژهەلات ناسێکی دژە ئیسلام بگیرێت ، یان رەخنە لە ئەو فلسەفە ناسە رۆژئاوایانە بگرێ ، چونکە هەمان رەفتارو گوفتاری بیرو باوەری ئەوانی هەلگرتووە ، بەلام ئەگەر یەکێك رەخنە لە دووکتابە پرە لە زانستەکەی صحیح بوخاری موسلم بگرێ ، ئەوا زۆر دلی پێ خۆشە و دەلێت : اشهد و باللەوایە.؟!

٤–مونافقی یان دوو ڕووی ئەم زەمانە" رقی لە مەزگەوت بانگ دان و تکبیر کردن ..؟!

٥–موناف یان دوو ڕووی ئەم زمانە " زۆر حەزی لە شهوەت بازی و ئارەزووی دونیایە ، سەفور یان رووتی بێ جلی و ئافرەتانە ، زۆر حەزی لەوەیە پیاوان و ئافرەتانی تێکەل بن لە شوێنە گشتیەکان و لە کور کوبوونەوەکان ، زۆر بێ شەرمانە دروشمی ژن و ژیان ئازادی دەلێنەوە کەچی ئافەرتەکانیان کردووە بە کویلەی خۆیان لەمالەکانیاندا باسی ئازادی ئافرەت دەکەن ، وە ئەگەر ئافرەتانی موسلمانان خۆیان حیجاب پۆش بکەن ، ئەوا دەلێن : ئەوا جلی عەرەبیە دژی جلی کوردی ، وە ئەگەر هەمان ئافرەت لاسایی جل و بەرگی ئافرەتی رۆژ ئاوایی بکەنەوە رووت بێت ، ئەوا زۆری پێ خۆشە ناموسەکەی بە دەربکەوێت و تەماشای عەرزو ناموسی خەلك بکات ، بێ گومان زۆر بێ شەرمانەش ئەم بەد رەوشتیە بە پێشکەوتن دەزانی شانازی پێوە دەکات..؟!

٧–مونافقی ئەم سەردەمە بە تۆپینی سەگێك فرمێسك دەبارێنی ، بەلام بە هەزاران خەلکی موسلمان لەولاتانی جیهان خوێنی دەرژێ و ، تەنانەت لە ولاتەکەی خۆمانیش ، لێ بێ ئاگایە ، هەروەها بە سووتانی دارستانی ئەمەزۆز غەم وپەژارەو و فرمێسك دەرێژی ، کە چی لە ولاتانی موسلمان بە هەزاران ژن و مندال بە ئاگری فرۆکەو تۆپ مووشکە دەستووتێن تەقەی سەری دێت یان دەلێت : ئەمانە تیرۆرستن یان کێ دەلێت وایە ، ئیتر بانگەشەیەك دەکات خەلك شەرم لەخۆی دەکات بەم مونافقە بلێ زەریەك مرۆڤایەتی لە ناخی دا هەیە ..؟!

٨–مونافقی ئەم زەمانە " دەبیستێ کە کۆنە کنیسەیەك رووخاوە یان سووتاوە ، دەلێت : حەیف مخابن ئەم شارستانیەت بوو یان کەلە پووری ئەم ولاتە بووە ، بەلام بە بەرچاوی بە سەدان مەزگەوت دەسوتێ بە تۆپ فرۆکە ئاگر بارانی مەزگەوتەکانی موسلمانان لە ولاتانی جیهان دەکرێت ، نوقەی یان فزەی لێوە نایەت ..؟!

٩–مونافقی ئەم زمانە " دەلێت : ئێمە هاتووین چاکسازی بکەین ، تۆی چاکە بچێ نین ، ئاودانی بکەینەوە گەدەلی و فسادی نەهێلین ، کەچی بەرپرسیاریە تێك وەردەگرێت ، خۆی دەبێتە سەر دەستە خراپەکاران و گەندەلکاران فسادی لە ناو گۆمەلگا بلاودەکاتەوە ، دەست دەکات بە خیانەت ناپاکی کردن لەو ئەمانەتی کە پێ سپێردراوە ..؟!

١٠-موناڤ ئەم زمانە " بانێك و دوو هەوایە ، تەماشای مێژوو دەكات ، بۆ نموونە ئەگەر هاوەڵێكی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵەیەكی هەبێت یان كەم كوریەكی وەك فترەتی مرۆڤانەی هەبێت ، ئەوا بە دەمە شەرو وورەكەی سەدان جار دوو بارەی دەكاتەوە ، وە درۆ بوختانی زیاتری لە سەر دەكات ، بەڵام باسی دڵۆپەیەك لە دەریایی چاكەكانی ناكات " با لە بیری نەكەین مونافقی یان دوو رووی ئەم زەمانە، ناسراوە بە رق قینە بەرانبەر (عمری كوری خەتاب ) — خوا لێ ڕازی بێت — كە دەریایەك لە چاكە كاری و حوكم و دادوەری و فەرمانرەوایی كردنی هەیە ، هەر گیزاو هەرگیز ناگەن بەو حكم ودادوەریەی كە ئەو كردوویەتی ، بۆیە چاو یان پێ هەڵنایەت ، چونكە بابو پیرانیان لە سەردەمی ئەو هاوەڵە بەرێزە بوونەتە بە موسڵمان ، وە لە سەردەمی ئەو فتوحات كراوە..؟!

١١-مونافقی ئەم زەمانە" زۆر پەرۆش ئارەزوومەندن ، بۆ ئایینەكەی باب باپیریان پێش ئیسلام ئەویش ئاگر پەرستی و بت پەرستی و رۆژ پەرستی بووە ، بێ شەرمانە بۆ ئایینە كۆنەكانی فارس بانگەشە دەكەن ، وە ئایینی سەردەشتی ، مزەكی خۆرمی ...هتد ئەگەریش بۆیان شوێنەكەی گونجاو بێت ، دەڵێن : ئیسلام ئایینی عەرەبەكان ، پێویستە ئێمە بۆ ئایینی سەردەشتی ئاگر پەرستن بگەرێنەوە ..؟!

١٢-موناڤ ئەم زەمانە " ئایین فرۆش خاك فرۆشە ، هەمیشە بۆ ئارەزو بەژەوەندیەكانی خۆی كار دەكات ، ئەگەر ئەقامەی وەلاتێكی پێ بدرێت ئەوا ئایینەكەی دەفرۆشێت بۆ ئەقامەكە، یان ئەگەر بەڵێنێكی پرو پووچی پێ بدرێت ئەوا ولات و خاكەكەی باب و باپیرانی دەفرۆشیت ، بۆ برێ پول و پارەی پیسی ئەم زەمانە ..؟!

١٣-مونافقی ئەم زەمانە " زۆر بە یان بەناوی جیاجیا ، وەك مرۆڤایەتی و كوردایەتی ، بە دەمارگیری نەتەوەیی كوێر بوون ، كەچی پێوەری راستی و ناراستی لە لای ئەوانە نەتەوەیە لە ژێر دروشمی نەتەوایەتی كوردایەتی خاك بفرۆشن خیانەت بكەن و هاونیشتمانەكەیان بكوژرێ ، دزی و گەندەلی و جەردەیی بكرێت ، ئاساییە تەنها دروشمە باق بریقەكانی خۆیان رەواجی هەبێ و ، چونكە بیر لە ئایین و ئیسلام و ولات خاك ناكەنەوە ، بە ناوی نەتەوایەتی خەلكی لە خشتە دەبن ، ئەگەر بیریان لای نەتەوەكەی بایە ئەوەندە گەندەلی دزی خاك فرۆشتنە نەدەكرا ..؟!

١٤–مونافقی ئەم زەمانە " زۆر دڵ تەنگ و غەمگینن بە زۆر و قەڵەباڵغی مەزگەوتەکان لە نوێژی هەینی و رۆژانی تریش ، یان ئەگەر کەسێك بچێت بۆ عەمرەو حەج ، دەڵێن : ئەم زێدەڕۆییە ، ئەگەر بە پارەیە ببەخشیایە بە هەژارێك یان فەقیرێك باشتر بوو " لە هەمان کاتدا بە تێکەڵ بوون لە رۆژانی تریش وەك سەری سالی زایینی یان ئەو ئاهەنگانەی کە رۆژئاوا وەبلاوی کردۆتەوە لە ولاتانی ئیسلام ، بە ملیۆنان دۆلار زێدەڕۆیی دەکرێت ، فەزەی لێوە نایەت تەقەی سەری دێت ، بەلکو لە ئاهەنگەکانیش بەژدار دەبێت ، زۆریش پێی دل خۆشە ..؟! تەنانەت ئەگەر موسلمانێك پێی بلێت : ئەم ئاهەنگەی سەری سالی زایینی یان میلادی دروست نیە لە رووی شەرعەوە " ئەوا بە تیرۆرست خراپەکاری تۆمەتباری دەکات ..؟!

١٥–مونافقی ئەم زەمانە " خۆی بە زاناو پێشکەوتوو و موصلح یان چاکەکار دەزانێت ، چونکە ئەی برای موسلمان هیچ پێت سەیر نەبێت کە باسی ئصلاح چاکسازی دەکات ..؟! ئەو لە ژێرەوەی هانی کردنەوەی مەی خانەو زیناخانە و دیسکۆ خانە و شتی بەدرەوەشتی دەدات بە بیانووی چاك سازی و رێکخستنی کۆمەلایەتی یە ..؟!!

١٦–مونافقی ئەم زەمانە " پیێ وایە پێشکەوتنی دەولەت کۆمەلگا بە مادە و مال و سامان زۆریە، یان بە هێنانی بەدرەوشتی لە ولاتانی رۆژئاوایە ، لەبەر لێك جیاکردنەوەی ئاین و دەولەت ، بۆیە دەلێت : دەبێت ئایینە لە مەزگەوتدا بێت " وە تەمەلی و دواکەتنی ئەمرۆیی موسلمانان بۆ ئیسلام دەگەڕێنێتەوە ..؟! چاوپۆشی دەکات لە هاندانی ئیسلام بۆ کارکردن و پرۆژەی ئیسلام و دادپەروەری کردن لە نێو موسلماناندا ..؟!

١٧–مونافقی ئەم زەمانە " سەیر لەوەدایە هەموو ئایینەکانیان خۆش دەوێت بەتایبەتی جوولەکە و گاورەکان ، تەنها ئایینی ئیسلام نەبێت ، رق یان لە موسلمانانی غەزەیە بۆ جوولەکە ناپاکەکان ، ئەی ئەمە نیفاق دوو رووی نیە ، لەم زەمانە حەز بکەن جوولەکە سەر بکەوێت ..؟!

١٨–مونافقی ئەم زەمانە ، بۆ ئاژاوەنانەوە سەرلیێ شێواندنی موسلمانان ، راستەو خۆ ناراستەخۆ شبهەو گومان دەدرکێنن لە سەر ناراستی فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ ..؟!

خوێنەری بەرزێز زیاتر لە خودا بترسە ، کە من و تۆ لەم سیفەتانە بیێ بەش بین ، پێویستە تەقوای (خوای گەورە ) بکەین خۆمان خاوێن بکەینەوە لە نیفاق کردن ...هتد

# ناسینەوەی کەسانی منافق یان دوو روو

بەڵێ کەسانی منافق یان دوو روو چەند نیشانەیەکی هەیە ،پێ دەناسرێتەوە ،ئەمانەی خوارەوە

١-کەسانی منافق بەردەوام خەریکی سوێند خواردن بە (خوای گەورە ) کەچی درۆ دەکەن و لە کاتی ئاشکرا بوونی مەبەست و هەلویستیان لە لای خەلکی دا ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ۝١٤﴾ [الْمُجَادلَة : ١٤] واتە : {جولەکە خوا غەزەبی لێگرتوون} [ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئایا نابینی کەسانێك کە مونافیقانن خۆشەویستی و دۆستایەتیان بۆ کەسانێك هەیە کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون کە جوولەکەن، واتە: مونافیق دۆستایەتیان بۆ جوولەکە هەیە کە مونافیقان نە لەگەڵ ئێوەدان وە نە لەگەڵ ئەوانیشدان [ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ] پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لەگەڵ چەند موسڵمانێك لە سێبەری ژوورێك لە ژوورەکانی دانیشتبوو، فەرمووی: ئێستا کەسێك دێت بۆ لاتان بە چاوی شەیتان تەماشا دەکات، کە هات قسەی لەگەڵ مەکەن، پیاوێکی شین هات پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بانگی کردو پێی فەرموو: بۆچی تۆو فڵان و فڵان جوێن و تانەو تەشەرم لێدەدەن؟ ناوی چەند کەسێکی هێنا، ئەم پیاوە ڕۆیشت بانگی کردن ئەوانیش سوێندیان خواردو داوای لێبوردنیان کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: وە بەدرۆ سوێند ئەخۆن و خۆیشیان ئەزانن کە درۆ ئەکەن..؟!

٢-مونافق هەمیشە پێ وایە کە فێل لە گەل (خوای گەورە ) دەکات ، هەروەك دە فەرموویت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە : بە دڵنیایی مونافیقان لەبەر نەزانی و نەفامیان بەگومانی خۆیان فێڵ لە خوای گەورە ئەکەن..؟!

٣-مونافق لە کاتی نوێژ کردن هەلناستن و لەشیان قورس و گرانە تەمبەلی دەکەن لە کاتی فەرزەکانی نوێژ کردن دا ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە: وە کاتێك کە ئەم مونافیقانە هەڵسن بۆ نوێژ کردن ئەوە زۆر بەتەمبەڵی هەڵئەسن وە قورسن و ناتوانن هەڵسن نوێژەکانیان بکەن..؟!

**٤–مونافق زۆر بە کەمی زیکر و یادی (خوای گەورە) دەکەن ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویّت :** قال تعالی: ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢﴾ [النِّسَاء : ١٤٢]
واتە : [ يُرَاءُونَ النَّاسَ ] وە بۆ ڕیاو ڕووبینی خەڵك ئەیکەن نەك وەکو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا- ﷺ اللە ﷺ وسلم – نە چاوەڕێی پاداشتن نە لە سزا ئەترسێن [ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ] وە زیکری خوای گەورە ناکەن لە ناو نوێژەکەیاندا زۆر بەکەمی نەبێ ئەویش لە پێش چاوی موسڵمانان..؟!

**٥-مونافق بەردەوام دوو دل و قەلەق و ڕارایە خۆی یەك لایی ناکەنەوە ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویّت :** قال تعالی: ﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ [النِّسَاء : ١٤٣] واتە : مونافیقان دوو دڵن لە نێوان موسڵمانان و لە نێوان موشریکاندا خۆیان یەکلا نەکردۆتەوە بۆ لای هیچ کامێکیان نە بۆ لای ئەمان خۆیان یەکلا کردۆتەوە نە بۆ لای ئەوان، بەڵکو لە رووکەشدا لەگەڵ باوەڕدارانن و لە ناوەڕۆك و ناخدا لەگەڵ کافرانن..؟!

**٦–مونافق هیچ کات ئیمان ناهێنێ ، چونکە مونافق شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام بە شێت و بێ عەقل و نەفام و نەزان دە زانن ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویّت :** قال تعالی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] واتە: [ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ ] ئەڵێن: ئایا ئێمە ئیمان بێنین هەروەکو چۆن ئەو کەسە سەفیهـ و گێل و نەزان و نەفام و کاڵفامانە ئیمانیان هێناوە (مەبەستیان صەحابەیە) (خوایان لێ رازی بێت) [ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ ] خوای گەورە لەسەر صەحابە دێتە وەڵام و ئەفەرمووێ: نەخێر ئەم مونافیقانە ئەمانە خۆیان گێل و نەزان و نەفامن بەڵام نازانن..؟!

٧–کەسی موونافق ئەگەر قسە بکات هەمیشەو بەردەوام درۆ دەکات.

٨– کەسی موونافق ئەگەر سپاردەیەك پیێ سپراد هەمیشە خیانەتی لیێ دەکات.

٩–کەسی موونافق ئەگەر وعد و پەیمانی دا ، هەمیشە جیێ بەجیێ ناکات و نایباتەسەر.

١٠–کەسی موونافق ئەگەر کیێشەی هەبوو یان دژایەتی کەسیێکی کرد ، هەمیشە لە حەق لادەدات ، وە حەق ناناسیێت .

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لیێ رازی بیێت – لە پیێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فيه كانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَن كَانَتْ فيه خَلَّةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَلَّةٌ مِن نِفَاقٍ حتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذَا عَاهَدَ غَدَرَ ، وإذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإذَا خَاصَمَ فَجَرَ . غيْرَ أنَّ فى حَديثِ سُفْيَانَ: وإنْ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ )) .[٢٠]

واتە: هەر کەسیێك ئەم چوار خەسلەتە و سیفەتەی تیێدا بیێت ئەوا موونافقی حەقیقی تەواوە ، ئەوا هەر کەسیش یەکیێکیانی تیێدا بیێت ئەوا سیفەتی موونافیقی یان دوو رووی تیێدایە ، تاکو وازی لیێ دەهیێنیێ ، کاتیێ قسە دەکات درۆ دەکات ، وە کاتیێ پەیمانیێك دەدات یان بەلیێنیێ ئەوا نایباتەسەر و خیانەتی لیێ دەکات ، وە ئەگەر وەعدی دەدات دەیشکیێنیێت ، وە کاتیێ دژایەتی کەسیێکی کرد و لە حەق لا بدات ستەمی لیێ بکات ..؟!

١١–کەسی موونافق بەردەوامە لە دوا خستنی نویێژەکانی بە تایبەتی نویێژی عصر .

لە (رافع بن خديج) – رەحمەتی خوای لیێ بیێت – لە پیێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ألا أُخبِرُكم بصلاةِ المنافقِ ؟ أن يُؤخِّرَ العصرَ، حتَّى إذا كانت الشَّمسُ كثَربِ البقرةِ صلاَّها)) .[٢١]

---

٢٠-صحيح مسلم برقم (٥٨).
٢١-صحيح الباني في السلسلة الصحيحة برقم (١٧٤٥).

١٢–كەسی مونافق زۆر بلێیه یان زۆر قسه دەكات بۆ ئەوەی حەق بشارێتەوە ، پێداگری دەكات لەسەر درۆ كانی خۆی حەق و راستیەكان دەشارێتەوە ، خۆی دەكاتە زاناو قسه زان له نێو خەلكی دا ، تەنها بۆ ئەوەی قسەی خۆی سەر بخات ، حەق بشارێتەوە ، چونكه ئیماندار كەم قسه دەكات و زرۆ كرداری هەیه ، بەلام كەسی مونافق زۆر قسه دەكات كرداری كەمه .

ئیمامی ( ئەوزاعی ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : ( أن المؤمن يقول قليلا و يفعل كثيرا وأن المنافق يقول كثيرا و يفعل قليلا ) واتە: ئیماندار كەم قسه دەكات ، وە كرداری زۆرە ، بەلام مونافق زۆر قسه دەكات ، كرداری كەمه ، هەلبەته سەرەرای ئەوەی زۆر قسه دەكات قسەكانیشی بریقەدار دەكات ، وە بەو زمانه لووسەی سیحر جادووی له خەلكی دەكات .

١٣–هەر گیز ئەم دوو كردەوە چاكه له مونافق كۆنابنەوە ، وەك رەوشت بەرزی ئاكاری جوان و تێگەیشتن له ئایین .

له (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((خَصلتانِ لا يجتمعانِ فى مُنافقٍ : حسنُ سَمتٍ وفقهٌ فى الدِّينِ )) .[٢٢]

واتە: ئەم دوو شته یان كردەوە چاكه له مونافق دا كۆنابنەوە : رەوشت بەرزی و ئاكاری جوان ، و حالی بوون له ئایین یان تێگەیشتن له ئایین .

[٢٢]-سنن الترمذي برقم (٢٦٨٥).

## ڕێگاكانی خۆپاراستن لە (نیفاق ) یان دوو ڕوویی

بەلیٚ لە پێشدا باسی نیفاق یان دوو رووی مان كردن ، پێناسە جۆرە كانی نیفاق یان دوو رووی مان باسكرد ، هەلبەتە زانیشمان جۆرو سیفەتەكانی چین ..؟! یان ترسناكی نیفاق چیە ..؟! ئینجا كاتی شارەزایی ئەم نیشانەنەی كەسی دوو روو بووین ..؟! پێویستە لەسەر هەموو موسلمانێكی خاوەن ئیمانی راستەقیە و بەهێز خۆی لە نیشانە و سیفەتانەی نیفاق یان دوو رووی بپارێزی ، وە خۆی لیٚ دوور بگریٚ ، ئەم خالانەی خوارەوە خۆپارستنە لە نیفاق دوو روویی :

١-دوور كەوتنەوە لە شوێن كەوتنی هەواو ئارەزووە كانی دونیا ، وە دەمار گیری ناحەق و بۆ شتی ناراست .

٢-حەز كردن بۆ رۆژی دوایی و تامەزرۆیی گەیشتن  بە بەهشت یان فردۆسی ئەعلی ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ۝١٠٧ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ۝١٠٨﴾ [الكَهۡف : ١٠٧ - ١٠٨]

واتە: [ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ] بە دڵنیایی ئەو كەسانەی كە ئیمانیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە، (كردەوەی چاك ئەوەیە بۆ خوا بێت و بۆ ریا نەبێت، وە لەسەر سوننەت بێت و بیدعە نەبێت) [ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ ] ئەمانە بەهەشتی فیردەوسیان بۆ هەیە كە ناوەڕاست و بەرزترین و چاكترین پلەی بەهەشتە، فیردەوس واتە: داری چڕ زیاتر بۆ دار مێو بەكاردێ لە زمانی عەرەبدا، وە لە زمانی تردا بە مانای بێستان دێت [ نُزُلًا ] واتە: شوێنێكە بۆیان ئامادە كراوە..؟! [ خَالِدِينَ فِيهَا ] بە نەمری و هەمیشەیی لە فیردەوسدا ئەمێننەوە [ لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ] بەهیچ شێوازێك لێی لانادەن و بۆ شوێنێكی تر ناچن و بێزار نابن، چونكە ئەوێ باشترین و بەرزترین شوێنی بەهەشتە كە عەرشی خوای گەورە لەسەرووی فیردەوسەوەیە ..؟!

٣-زۆر دوعا و پارانەوە كردن و داوایی لیٚ خۆش بوون كردن ، وە پەلە كردن لە تەوبە كردن لە كاتی كردنی هەر گوناهو تاوانێك كە دێتە سەر رێگات ، بە پلە داوایی لیٚ خۆش بوون بكەی .

٤–لە کاتی تاوان کردن یان هەر کاتێك تۆمەتبار کردن و سەر زەنشت کردن و محاسبە کردنی نەفسی خۆت یان دەروونی خۆت بەردەوام ، لە هەر گوناهو هەلەیەکی رۆژانە ، یان بە کەم تەرخەمی و نیفاق ، بەلکو هەولی خۆ رزگار کردن بدات لە سزایی (خوای گەورە ) ، وە خۆی بە ئەمین و پارێزراو نەزانی لە هەر هەلە گوناهو تاوانێك ، بەردەوام وا هەست بکات گوناهکارە سزای (خوای گەورە ) دە گرێتەوە ، ئەوا بەدلنیایەوە دوو ر دەبێت لە هەر نیفاق و دوو روویەك .

٥–دوور کەوتنەوە لە بیدعەو داهێناراوەکان بە ناوی ئایینەوە ، یان هاوەلی کردنی صوفی دەرویش کەسانی خورافی و بێ علم و زانست شەرعی و بیدعەچی ، چونکە ئەوان هۆکارێکی سەرەکەین بۆ راکێشان بۆ نیفاق دوو رووی .

٦–وسوربوون بەردەوام بوون لە سەر شوێنکەوتنی سوننەت و فەرموودە و هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە شوێنکەوتوان و ئەوانی دوایی شوێنکەتوان ، هەروەها پێشینە چاکە کان .

٧–گەران بەدوایی زانستی شەرعی لە هەر وشوێنکدا ، چونکە بەزانست کەسانی ئیماندارو جیا دەکەیتەو لە کەسانی موناقق و دوو روو .

٨–هەولدان و خۆ راهێنان لە سەر نیەت پاکی دلسۆزی تەنها بۆ (خوای گەورە ) ، وە هیچ کردەوەیەك لە پێناوی فلان کەس و فیسکە نەکات ، بەلکوی ئەوەی دەیکات تەنها لە پێناوی (خوای گەورە ) بێت ، وە ویژدانی خۆی تێدا ئاسودە بکات لە هەر کارو کردەویەك ئەنجامی دەدات ، وە لەبەر هیچ کەسف فیسکە یەك واز لە کردەوەی چاکە نەهێنی ، هەر بۆیە بەم شێوەیە زرگاری دەبێت ، لە ریا بازی و شریك نیفاق یان دوو رووی .

٩–بەردەوام بوون لە سەر زیکر و یادی (خوای گەورە) ، بێ گومان کەسی ئیمانداری راستە قینە یان موسلمانی راستە قینە زۆر زیکر و یادی (خوای گەورە ) دەکات ، بەلام بێ گومان کەسی مونافق یان دوو رووی ، تەمبەل و کە تەرخەمە لە زیکر و یادی (خوای گەورە ) ، بە پێچەوانەوە زۆر کەم زیکرو یادی (خوای گەورە ) دەکات ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە: {هەندێك لە سیفاتی مونافیقان} [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ ] بە دڵنیایی مونافیقان لەبەر نەزانی و نەفامیان بەگومانی

خۆیان فێڵ لە خوای گەورە ئەكەن [ وَهُوَ خَادِعُهُمْ ] لەبەرامبەر ئەو تاوانەیان خوای گەورە هاوشێوە ی خۆیان لەگەڵیاندا دەكات وە ئەیانخەڵەتێنێ و فێڵیان لێ دەكات، تا بەردەوام بن لە گومڕایی خۆیان و نەچنە سەر ڕێگای ڕاست، (ئەم سیفەتە بەتەنها بۆ خوای گەورە بڕیار نادرێ بەڵكو لەبەرامبەر كافراندا وەكو تۆڵەسەندن و ئینتیقام بۆ باوەڕداران) [ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى ] وە كاتێك كە ئەم مونافیقانە هەڵسن بۆ نوێژ كردن ئەوە زۆر بەتەمبەڵی هەڵئەسن وە قورسن و ناتوانن هە ڵسن نوێژەكانیان بكەن [ يُرَاءُونَ النَّاسَ ] وە بۆ ڕیاو ڕووبینی خەڵك ئەیكەن نەك وەكو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - نە چاوەڕێی پاداشتن نە لە سزا ئەترسێن [ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ] وە زیكری خوای گەورە ناكەن لە ناو نوێژەكەیاندا زۆر بەكەمی نەبێ ئەویش لە پێش چاوی موسڵمانان..؟!

**(ابن القيم ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : زۆر یادی (خوای گەورە) كردن دەبیٚتە پاریٚزەر لە نیفاق یان دوو ڕوویی ، چونكە كەسی مونافیق كەم یادی (خوای گەورە ) دەكات ..؟!**

**( كەعب ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : هەر كەسیٚك زۆر یادی (خوای گەورە) بكات ، ئەوا دوور دەكەویٚتەوە لە نیفاق و دوو ڕوویی . هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت:** قال تعالى:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩﴾ [المُنَافِقُون : ٩] واتە: { با ماڵ و منداڵ سەرقاڵتان نەكات لە زیكری خوا} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ ] ئەی باوەڕداران با ماڵ و منداڵتان سەرقاڵتان نەكەن لە زیكرو یادی خوای گەورەو لە قورئان خوێندن و لە ئەنجام دانی فەرزەكان [ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] وە هەر كەسێك وا بكات و سەرقاڵ بێت بە دونیاوەو دونیا سەرقاڵی بكات لە عیبادەت و دینداری و زیكری خوا ئا ئەو كەسانە بەڕاستی خۆیان زەرەرمەندن..؟!

**١٠–بۆ ئەوەی لە نیفاق و دوو ڕوویی ، خۆت بپاریٚزی ، بەردەوام چوونە نویٚژی جەماعەت و ، وە زوو چوون بۆی ، وە هەبوونی خشوع لە نویٚژەكاندا ، وە دەست گرتن بە نویٚژە سوننەتەكان بە تایبەتی شەو نویٚژ ، كە رەوشتی پیاوچاكانە ، بیٚ گومان ئەوان لە لایان زۆر ئاسان بووە ، بەلام مونافق یان دوو ڕووەكان بەردەوام لەسەریان قورس گران و زەحمەتە .**

١١-ترسان لە لاوازی ئیمان یان کەم کردنی ولادان و گومرا بوون ، وە داوا لە (خوای گەورە) بکات بەردەوامی پیێ بخەشێت بپارێتەوە ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ۝٨﴾ [آل عِمْرَان : ٨]واتە: [ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ] ئەمە هەر قسەی زانا چەسپاو و دامەزراوەکانە لە عیلمدا ئەڵێن: ئەی پەروەردگار دڵمان لە حەق لانەدەی بەوەی کە شوێن ئایەتی موتەشابیە بکەوین لە دوای ئەوەی کە هیدایەتی ئێمەت دا بۆ حەق [ وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ] وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەمان پێ بکە بە دڵنیایی هەر تۆ بەخشەری هەموو شتێکی ..؟! هەر بۆیە دەبێت بەردەوام دوا لە (خوای گەورە) بکەیت دل و دەروونت پاك بکەیتەوە لە دوو روویی .

١٢-سوور بوون لەسەر ئەوەی نیشانەیەك لە نیشانەکانی مونافقی تێدا نەبێت ..! ! وەکو درۆ کردن و بوختان کردن ، هەروەها خیانەت و ناپاکی کردن لەئەمانەت ، وە شکاندنی وعد و پەیمان و بەلێن ، وە رق بوونەوە لە جیهاد و تیێ کۆشان لە پێناوی (خوای گەورە ) ، یان خۆشەویستی کردنی کەسانی بیێ باوەر و موشریك و مونافق و مولحید و ئەوانەی دژی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کار دەکەن ، یان هەولدان بۆ لە کار خستنی حوکمی شەرعی ئیسلام ، ئەمانە هەر هەمووی نیشانەو سیفەتەکانی مونافیق و دوو رووەکانە ، بۆیە دەبێت خۆت بپارێزی لەم کردەوە خراپانە، جا ئەوەی یارمەتی دەر بۆ موسلمان ئەویە باوەرێکی بە هێزو دامەزراوی هەبێت ، وە بە گەوردانانی (خوای گەورە ) و خۆشەویستی بۆ (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ و هاوەلانی، وە بەردەوام سوور بوون یان جەخت کردنەوە لەسەر سەلامەتی دل دەروون و نەخۆشیەکانی دڵ ..! !

١٣-شانازی کردن بە عقیدە و بیرو باوەری ئاینی ئیسلام ، وە پەرستن و عیبادەتی (خوای گەورە) بە تەنها ، هەر وەها شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە دەست گرتن بەم ئاینەوە ، بیێ گومان پەنا بباتە بەر (خوای گەورە ) ئەوا بە عیزەت و شکۆمەندی دەکات ، وە هەر کەسێك پەنا بباتە بەر مرۆڤەکان ئەوا عیزەت شکۆمەندیەکەی بەرەو لە ناو چوون دەچێت ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۝١٣٩﴾ [النِّسَاء : ١٣٩] واتە: [ الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ] ئەو مونافیقانەی کە کافران ئەکەنە دۆست و

خۆشەویست و پشتیوانی خۆیان جگە لە ئیمانداران کە ئەبوایە ئیماندارانیان بکردایە بەدۆست و پشتیوان و خۆشەویستی خۆیان بەڵام کافرانیان کرد [ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ ] ئایا بەدوای عیزەتدا ئەگەڕێن لەلای کافران وا ئەزانن عیزەت و سەرکەوتن و زاڵ بوون و هێز لای کافرانە [ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ] بە دڵنیایی عیزەت هەر هەمووی بۆ خوای گەورەیەو بەدەست خوای گەورەیە بیەوێ هەر کەسێك بەعیزەت بکات بەعیزەتی دەکات و عیزەت لای کافران نیە..؟!

**بێ گومان هەر (خوای گەورە) خاوەنی هەموو مولکەکانە ، وە مولك دەسەلات بە هەر کەسێك ئەبەخشێ کەویستی لێ بێت ، وە ل هە کە سێکی ویستی لێ بێت لێ وەردەگرێتەوە ، وە هەر کەسێك ویستی لێ بێت بە عیزەت شکۆمەندی دەکات ، وە هەر کە سێکیش ویستی لێ بێت زەلیلی دەکات ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالی: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦﴾ [آل عِمۡرَان : ٢٦] واته: [ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ ] ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - بڵێ: ئەی پەروەردگار تەنها تۆ خاوەنی هەموو موڵکەکانی [ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ ] موڵك بە هەر کەسێك ئەبەخشی کە ویستت لێ بێت [ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ ] وە لە هەر کەسێکی وەرئەگریتەوە کە ویستت لێ بێت [ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ ] وە هەر کەسێك بە عیزەت ئەکەی کە وویستت لێ بێت [ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ ] وە هەر کەسێك زەلیل ئەکەی کە ویستت لێ بێت [ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ] خێرو چاکە تەنها بەدەستی تۆیە، وە بە دڵنیایی هەر تۆ تواناو دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ..؟!

**١٤–سووربوون و بەردەوام بوون بۆ هەمیشە لە سەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ، لایەنی کەم لە مانگێکدا جاری هەموو قورئان بخوێنی یان خەتمی بکەی ، وە (مدبر ) یان هەولدان بۆ تێگەیشتنی ماناو مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز ، وە بەکار هێنانی لە ژیانی رۆژانە خۆت ، یان وە شفاء ، وە بانگەوازی کردن بۆ لای حوکم و شەرعی قورئانی پیرۆز ، بێ گومان ئەم شتانە زۆر ئاسانە بۆ کەسی ئیمانداری راستەقینە ، یان بۆ کەسێك (خوای گەورە ) بناسێ و لە قورئانە پیرۆزەکەی بگات ، ئەوا (خوای گەورە ) بۆی ئاسان دەکات ، بەلام بە پێچەوانەوە بۆ کەسی** مونافیق یان دوو روو زۆر قورس گرانە و زەحمەتە، چونکە ئەستەم و قورسە لە سەر مونافیقەکان و دوو رووەکان .

١٥–چاكە كردن و مال بەخشین لە پێناوی (خوای گەورە ) ، وە دانانی زەكات ، وە فەرمان كردن بە چاكە و رێگری كردن لە خراپە ،هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ [آل عِمۡرَان : ١١٠] واتە : { ئوممەتی ئیسلام باشترین ئوممەتن} [ كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ] ئەی ئوممەتی ئیسلام ئێوە لەناو حەفتا ئوممەتدا باشترین و چاكترین و بەسودترین ئوممەتن كە دەركەوتبێتن و هاتبێتن بۆ خەڵكی، كە حەفتا هەزار لەم ئوممەتە بەبێ لێپرسینەو سزا دەچنە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - داوای كرد خوای گەورە بۆی زیاد بكات خوای گەورەیش لەگەڵ هەر هەزارێك حەفتا هەزاری تری بۆ زیاد كرد، ئەمەیش بەهۆی گەورەیی و بەڕێزی پێغەمبەری خواوەیە - صلى الله عليه وسلم - ، وە باشترینی ئوممەتی ئیسلامیش هاوەڵانن چونكە گفتوگۆ كردن لەگەڵ ئەوانە، وە لەقیامەتیش هەر ئوممەتی ئیسلام باشترین ئوممەتن و یەكەم ئوممەتن كە دەچنە بەهەشتەوەو نیوەی خەڵكی بەهەشت پێك دەهێنن [ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ] چونكە فەرمان ئەكەن بەچاكەو رێگری و قەدەغەی خراپە ئەكەن، وە ئیمان بەخوای گەورە ئەهێنن..؟!

١٦–وەك باسمان كرد دوعاو پارانەوە چەكی ئیماندارە دەی پارێزێت لە كەوتنە نێو نیفاق و دوو روویی .

لە (جوبەیری كوڕی نوفەیر ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : چوومە لای (ابو درداء ) – خوا لێ رازی بێت – لە ماڵەكەی خۆیدا لە (حمیس ) ، و بینیم نوێژی دەكرد ، وكاتێ دانیشت و تەحیاتی خوێند پەنای دەگرد بە (خوای گەورە) لە نیفاق و دوو روویی ..! ! كاتێ لێ بوویەوە پێم ووت: خوا لێت رازی بێت ئەی (ابو درداء ) تۆ و نیفاق زۆر لێك دوورن ، یان تۆ نیفاق دوورن لەیەكەوە ..؟!

ئینجا (ابو درداء ) لە وەڵامدا ووتی : ( اللهم غفرا – ثلاثا – ، من يأمن البلاء ..؟! من يأمن البلاء ..؟! والله إن الرجل ليفتتن في ساعة فينقلب عن دينه ) واتە : سێ جار ووتی : خودایە لێم ببورە ، كی ئەمینە لە بەلا ..؟! كێ ئەمینە لە بەلا ..؟! دەی سوێند بە خودا پیاوی دوا هەیە لەیەك سەعاتدا تووشی فیتنە دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە لە ئایینەكەی ..؟!

١٧-خۆ راهێنان و رازاندەوە لە سەر سیفەتی راستگۆیی لە هەموو کارو کردەوەیەکدا : چونکە راستگۆیی جیاکەرەوەی کەسی ئیماندارە لە موونافیق و دوو رووکان .

لە( ابن تیمیە ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلێت : ( الصفة الفارقة بين المؤمن والمنافق هو الصدق ، فإن أساس النفاق الذي بني علية الكذب ) .واتە : سیفەتی جیکەرەوەی کەسی باوەردار لە کەسی موونافیق راستگۆییە ، ینچینەی دوو روویی کە لە سەری بونیاد نراوە درۆیە .

داوا لە (خوای گەورە) دەکەین هەموو لایەکمان بپارێزی لە نیفاق و دوو روویی (امین )..؟!

# درۆ کردن هۆکارێکە بۆ فاسق بوون یان لادان

مسلمانانی خۆشەویست دەمانەوێت باسی فسق بکەین ، یان بەکێ دەوترێت فاسق ..؟! وا دیارە درۆ کردنیش هۆکارێکە بۆ فاسق بوون ، وە چەند جۆری هەیە سزاو حوکمی شەرعی چی یە؟!بۆ فاسقە کان لە دونیا و لە دوا رۆژ دا ، وە زیانی کەسی فاسق چیە بۆ خۆی و کۆمەلگاکەی ..؟!

پێناسەی : فسق یان فاسق :

لە راستی دا ئەوەی زۆر بەکاردێت بۆ پێناسەی فاسق ئەوەیە کە دەوترێت : ( فاسق بە زۆری ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ئیسلام بن و گویرایەلی شەرعی (خوای گەورە) یان کردبێت إقراریان بە شەرعی (خوای گەورە) کردبێت ، پاشان بە رەزامەندی خۆی وازبهێنی لە گوێرایەلی کردنی زۆرێك لە حوکمە شەرعییە کان یان لە هەندێك ، ئەو کەسەش هەر رەگەزێ بێت یان هەر چیە بێت دەسەلاتدار بێت یان بێ دەسەلاتدار ، لاواز بێت یان بە هێز ، هەژار بێت یان دولەمەند ، سپی پیست بێت یان رەش پێست ، کە ئەم سیفەتانەی تێدا بەدی کرا ئەوا کەسێکی فاسقە یان نیشانەی فسق بوونی هەیە .

هەروەها (فسق ) یان فاسق بوون ، بەو کەسەش دەوترێت : کە گوناهو تاوانی گەورە و بچووك ئەنجام بدات ، وە بەردەوام بێت لە سەری وەکو واز نە هێنانی لە درۆ کردن ، لە راستی دا بە مشك دەوترێت لە زمانی عەرەبی دا (فویسقە ) چونکە گیاندارێکە سیفەتی پیسی هەلگرتووە ، هەر لە بەر ئەمەش پێغەمبەری لە فەرموودەیەکدا باسی دەکات دەفەرمووێت : مشك بکوژن ..؟!

لە (جابر بن عبدالله ) – خوا لیّ رازی بیّت – لە پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((فإنَّ الشيطانَ لا يفتحُ غلقًا، ولا يحلُّ وكاءً، ولا يكشف إناءً، وإنَّ الفُويسقةَ تضرمُ على الناسِ بيتَهم)) .[٢٣] واتە: چونكە شەيتان دەرگای داخراو ناكاتەوە ، گریّ و دەمی بەسارا ناكاتەوە ، ئەو دەفر و قاپ و قاجاخانەی داپۆشران پشكنيان بۆ ناكات ، ئەوانەی كون دیّنە دەرەوە وەك مشك و جرج و ئاگر بەردەدەنە مالی خەلك و مالە كانيان دەسوتيّنين ئەگەر ئاگر و چراكانيان نە كوژیّنەوە ..؟!

بەلیّ كەسی فاسقيش هەر بە هەمان شیّوە زۆریّك لە تاوانە كان يان هەنديّك تاوانە پيسەكان ئەنجام ئەدات بە ئارەزووی خۆی لەبەر ئەوەی پیّ دەوتریّت : كەسیّكی فاسق ، چونكە هەر كەسیّك تاوان ئەنجام بدات و پەشيمان نە بیّتەوە و بەردەوام بیّت لە سەری ئەوە دەبیّتە سيفەتیّكی ناشرين و قیّزەون ، هەر بۆيە ئەم كەسە بە كەسیّكی سيفەت ناشرين دەناسریّت لە نیّو خەلكی دا ، هەر وەك ئەو كەسەی بەردەوام لە هەر قسە كردنیّك دا دەبیّت ، ئيلا درۆ تیّ بكات ، دواتر لە نیّو خەلكی بە درۆزن دەناسریّت و ناو دەبریّت ، هەر بۆيە جیّگەی خۆيەتی كە پیّ بووتریّت : كەسیّكی گوناه كاور تاوانكار يان كەسیّكی درۆزن ، ئەم سيفەتانەش پیّ دەوتریّت: فاسق يان فسقی كردووە .

(قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦﴾ [الحُجُرَات : ٦] واتە: {دلْنيا بوون لە هەوالْ} [ يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ] ئەی باوەڕداران ئەگەر كەسێكی فاسق و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە هەواڵێكی بۆ هێنان ئێوە تەبەیون و تەثبوت بكەن و پەلە مەكەن لە بڕیارداندا تا دڵنیابن كە ئەو هەواڵە ڕاستە چونكە دواتر لەوانەیە كەسانێك بە نەزانی تووشی زەرەرو زیان بكەن وە هەڵەتان لێ ڕوویدات وە دواتریش پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ئەو هەڵەیەی كە كردووتانە، كە وتراوە: لەسەر (وەلیدی كوڕی عوقبەی كوڕی ئەبی موعەیط) دابەزیوە كە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناردوویەتی بۆ كۆكردنەوەی زەكاتی (بەنی موستەلیق)..؟!

[٢٣]-سنن الترمذي برقم (١٨١٢).

لە ( ابن القیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (النبأ) بریتیە لە هەوالێکی نادیار لە سەرچاوەی هەوالەوە بە مەرجێك هەوالە کە شکۆ و گەورەییەکی تێدا بێت ، وە لێرەدا سوودێکی ووردی هەیە : (خوای گەورە) فەرمانی نەکردووە ، بە ردەکردنەوەی هەوالی کەسی (فاسق ) بە درۆزانینی و رەدکردنەوەی شایەتی ئەو کەسە بە یەکجاریی ، بەلکو فەرمانی بە رۆشنکردنەوە کردووە ، گەر بەلگە و نیشانە لەدەرەوە بوونی هەبوو کە راستگۆیی کەسەکەی دەسەلماند بە بەلگەی راستی کاردەکرێت ، هەوالەکە هەر کەسێك رایگەیاندبێت ، بە جۆرە دەبێت شان لەسەر ریوایەتی و شایەتی کەی فاسق دابدرێت، زۆرێك لە فاسقەکان لە هەوال و گێرانەوە و شایەتیداندا راست دەکەن ، بەلکو زۆر بەیان ئەو پەری هەولی راستگۆیی دەدات ، فیسقەکەی لایەکی ترەوەیە ، نموونەی ئەو کەسانە هەوال وشاهادەتی رەد ناکرێنەوە ، گەر شایەتی و هەوالی ئەم جۆرانە رەد بکرێنەوە بە شێکی زۆر لە مافەکان تیادەچن و پەکیان دەکەوێت ، ئەو کاتە زۆرێك لە هوالی راست بە پووچ دەردەکرێن ، بە بایبەت ئەو کەسەی لادانە کەی لە رووی باوەر و بۆ چوونەوەیە ، ئەو بەدوای راستیدا دەگەرێتەوە و دەپشکنێت ، ئەم کەسانە نە هەوالە کانیان و نە شایەتیدانە کەیانیان رەد ناکرێنەوە .

هە ر لە ( ابن القیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت :ئەو کەسەی فیسقەکەی لە رووی درۆوەیە : گەر زۆری لێ بینرا و چەند بارە بوویەوە بە جۆرێك درۆی زال بێت بە سەر راستیدا ئەو کەسە نە هەوال و نەشایەتی لێ وەرناگیرێت ، وە ئەگەر بە دەگمەن لێ بینرا جارێك دوو جار ئەوا لە رەدی شایەتی و هەوالیدا لای زانایان دوو جۆرە هەیە.

## جۆرەکانی فسق یان لادان

یەکەم: (فسق ی گەورە) واتە: بریتیە لە لادانی بێ باوەری ،کە کەسەکەلە ئیسلام پێ دەر دەچێت، بێ گومان (فسق )ی گەورە خاوەنەکەی لە چوارچێوەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە ، هەر بۆیە هەر کەسێك ئەنجامی بدات و بەردەوام بێت لەسەری و پەشیمان نەبێتەوە و بەو حالە یەوە بمرێ ، ئەوە پاشە رۆژێکی ترسناك چاوەروانی دەکات ، ئەویش چوونە ناو ئاگری دۆزەخە بە هەتا هەتایی پە نا بەخوا ..!!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦]واتە: خوای گەورە بەهۆی ئەم نموونانەوە کەسانێك گومڕا ئەکات (واتە: موونافیقان)، وە کەسانێکیش هیدایەت ئەدات (واتە: باوەڕداران)، وە هیچ کەسێك بەهۆی ئەم نموونانەوە گومڕا نابێ تەنها کەسانێك کە خۆیان فاسق بن و دەرچوو بێتن لە گوێڕایەڵی خوای گەورەو گاڵتەو سووکایەتیان بە فەرموودەی خوای گەورە کرد بێت (واتە: موونافیقان).

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٩٩] واتە: [ وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ] وە چەندەها ئایەت و بە ڵگەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکرامان بۆ تۆ ناردووە ئەی محمد صلى الله عليه وسلم کە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتیت [ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ ] وەهیچ کەسێك کوفری پێ ناکات تەنها کەسانێکی فاسق و لە ڕێ دەرچوو نەبێت..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾﴾ [السَّجْدَة : ٢٠] واتە: [ وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ ] وە بە دڵنیایی ئێمە سزا نزیکە کەمەکەی دونیایان پێ ئەچێژین لە دەردو نەخۆشی و بەڵاو موسیبەت و وشکەساڵی و گرانی و کوشتن و جێبەجێ کردنی سنوری خواو تێکشان لە جەنگدا کە لە دونیا تووشیان ئەبێ جگە لە سزا گەورەکە کە سزای ڕۆژی قیامەتە [ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ] واتە: لە دونیا کە تووشی بەڵاو موسیبەت و ناخۆشی و سزایان ئەکەین بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو تەوبە بکەن و ئیمان بێنن..؟!

**دووەم : (فسق ی بچووک ) بریتە لەوەی موستەحەقی ئاگری دۆزەخە ، واتە: خاوەنەکەی لە چوارچێوەی ئیسلام دەمێنێتەوە و ناچێتە دەرەوە ، بەلام موستەحەقی نێو ئاگری دۆزەخ دەبێت ، بە ئەندازەی ئەو تاوان و خراپەکاریانەی کە ئەنجامی داوە ، بەم هۆیەوە دواجار بە هۆی ئیمانەکەیەوە لە دۆزەخ رزگاری دەبێت ، ئەم جۆرە فسقەش بوونی زۆر هەیە لە نێو کۆمەلگای موسلمانان ، وە بۆ تە دیاردەیەکی کوشندە لە زەمانەدا ، زۆر بەی خەلکی بە دەستیوە دەنالێنن ، بە تیبەتی لە نێو خێزان و کۆمەلگاو تۆرەکۆمەلە یاتیەکان لە سەردەمەدا یان لەم زەمانددا ، بۆتە دیاردەیەکی زۆر ناشرین و قێزە ون ، خێزانەکانی لێك ترازاندووە ئەم جۆرە (فسقە ) چونکە بە تەواوەتی خەلکی بردووە بەرەوە سیفەتێکی خراپی کۆمەلایەتی ، یان دوور لە بەهاکانی مرۆڤ ، بەلکو ئەجۆرە (فسقە ) ئەوەندە کوشندەیە متمانەی نەهێشتووە ، وەك ئەوەی راگەیاندی هەوالی بیٚ بنەماو ناراست و نادروست لە ناو تۆرەکۆمەلایەتیەکان ، یان بوختان کردن بە ناحەق ، جا چ لە لای کەسانی ئاسایی بێت یان چ لەلای بەرپرسانی حوکمەت ، درۆ و فسق یان فاسقی بۆ تە بەدیاردەیەکی زۆر گەورە ، ئەویش خۆ ناشیرین کردن بە جنێو دان بە خەلکی ، یان خۆ سووك کردن بۆ بەدەست هێنانی برە پارەیەك ، خۆ خێزانەکەی پێشانی ئەم خەلکە دەدا ، یان جنێو دانی بیٚ بنەما بە خەلك و بە بەرپرسانی حومەت ، ئەمانە هیچ رەوشتی موسلمان و مرۆڤ نیە ، کە ئێستا دەگوزەرێت لە نێو کومەلگا ئیسلامیەکان بەگەشتی ، بە تایبەتی لە نێو وەلاتی خۆمان ، ئێمەی کورد دوور بوونیە لەم رەوشتە ناشرینانە ، هەلبەت خاوەنی رەوشتی بەرز بووینە لە رابردوودا خاوەن شەرف کرامەت ، عزەت شکۆ ناسراوین لە نێو هەموو جیهاندا ، بەلام ئەگەر ئێستا سەیری بکەین هیچ سەر سوورمان نیە ..!! ئێمە پێشبرکیٚ دەکەین لە گەل ولاتان بە هەوالی نادروست و جنێودان ، خراپەکاری بەد رەوشتی ، هەرەوەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت:** قال تعالی: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٠﴾ [السَّجۡدَة : ٢٠] واتە: {دڵنیا بوون لە هەواڵ} ئەی باوەڕداران ئەگەر کەسێکی فاسق و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە هەواڵێکی بۆ هێنان ئێوە تەبەیون و تەثبوت بکەن و پەلە مەکەن لە بڕیاردانددا تا دڵنیابن کە ئەو هەواڵە ڕاستە چونکە دواتر لەوانەیە کەسانێك بە نەزانی تووشی زەرەرو زیان بکەن وە هەڵەتان لێ ڕووبدات وە دواتریش پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردووتانە، کە وتراوە: لەسەر (وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط) دابەزیوە کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناردوویەتی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی (بەنی موستەلیق).

## کێن ئەو کەسانەی سیفەتی فاسقیان هەلگرتووە

**١-(إبليس) فاسقە چونکە یەکەم کەس بوو ، گوێڕایەڵی فەرمانی (خوای گەورە)ی نەکرد ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ٥٠﴾ [الكَهْف : ٥٠] واته: [ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ ] کاتێك ئێمە بە فریشتەکانمان وت کڕنۆشی ڕێزو ئیحترام و بەگەورەزانین بۆ ئادەم بەرن [ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ ] هەموویان کڕنۆشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە کڕنۆش بۆ ئادەم بەرێت و وتی: من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە خۆڵ دروست کردووە [ كَانَ مِنَ الْجِنِّ ] وە ئیبلیس مەلائیکەت نەبووە بەڵکو لە جنی بوو [ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ ] وە لە گوێڕایەڵی و فەرمانی خوای گەورە دەرچوو [ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي ] ئایا ئێوە ئیبلیس و نەوەکانی ئەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان جگە لە من لە دوای ئەوەی کە بێ فەرمانی خوای گەورەی کرد [ وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ ] لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن [ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا ] خراپترین شتە کە ستەمکاران خۆشەویستی و پشتیوانی خوای گەورە ئەگۆڕنەوە بە شەیتان ..؟!

**٢-(كافر ) واته: کەسانی بێ باوەر ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ وَمَا يَكۡفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقُونَ ٩٩﴾ [البَقَرَة : ٩٩] واته: [ وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ] وە چەندەها ئایەت و بەڵگەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکرامان بۆ تۆ ناردووە ئەی محمد صلى الله عليه وسلم کە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتیت [ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ (٩٩) ] وەهیچ کەسێك کوفری پێ ناکات تەنها کەسانێکی فاسق و لە ڕێ دەرچوو نەبێت..؟!

**٣-(اليهود والنصارى ) واته: جوولەکەو گاورەکان ، کە ئەوانە باوەر ناهێنن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە دلنیایەوە ئەوانە فاسقن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿۞ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ١٦﴾ [الحَدِيد : ١٦] واته: {کاتی ئەوەیە دڵتان بۆ قورئان نەرم بێت} [ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ

اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ ] ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران دڵیان نەرم بێ لە کاتی زیکری خوای گەورەو بیستنی قورئان و خوێندنەوەی، وە لەو حەقەی کە قورئانەو بۆیان دابەزیوە تا ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆی، (ئیبنو مەسعود) دەفەرمێت: (تەنها چوار ساڵ بوو موسڵمان ببوین خوای گەورە بەم ئایەتە گلەیی لێکردین) [ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ] وە وەك ئەو کەسانە نەبن کە ئەهلی کتابن لە جوولەکەو گاورەکان کە پێش ئەوەی قورئان دابەزێ ئەمان کتابیان بۆ هاتبوو بەڵام کە سەردەمیان دوورکەوتەوە لە پێغەمبەرانیان دڵیان ڕەق بوو، وە زۆرێك لەوان فاسق بوون و لە ڕێگای ڕاست و گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوو بوون، (خوای گەورە بەرهەڵستی لە موسڵمان دەکات لە خۆچواندنیان بە گاورو جولەکە کە دەستکاری کتابی خوای گەورەیان کردو دونیایان پێ کڕی و پشتگوێیان خست و وازیان لێهێناو روویان لە بیرو بۆچوونی خەڵکی کردو لاسایی کوێرانەیان کردنەوە خوای گەورەیش دڵی ڕەق کردن)..؟

٤-(منافقون ) **واتە: دوو ڕووەکان فاسقن ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى:

﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾﴾ [التَّوۡبَة : ٦٧] واتە: بەڕاستی مونافیقان ئەوانن کە فاسقن و دەرچوون لە گوێڕایەڵی خوا..؟!

٥–(لم يحكم ) **واتە: ئەوانەی حکم بە شەرعی ناکەن ، یان گوێڕایەلی فەرمانەکانی (خوای گەورە) نابن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ [المَائـِدَة : ٤٧] واتە: وە هەر کەسێك حوکم نەکات بەو قورئانەی کە خوای گەورە دایبەزاندۆتە خوارەوە [ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ] ئەوا ئەو کەسانە فاسقن و لە گوێڕایەڵی خوا دەرچووونە..؟!

٦–(فمن تولى ) **واتە: ئەوانەی کەپشت هەلدەکەن یان پشت لە پەیمان و ئایینی (خوای گەورە) دەکەن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ٨٢] واتە: [ فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ ] جا هەر کەسێ لەو عەهدو بە لێن و پەیمانە پشتهەڵکات [ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ] ئەوانە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچووونە ..؟!

٧–(شهاده) **واتە: شاهیدی دانی بە درۆ کردن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت:** قال تعالى: ﴿وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَـٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤﴾﴾ [النُّور : ٤] واتە: [ وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ] وە بۆ هەمیشەیش شایەتی لەو کەسانە قەبووڵ ناکرێت کە خەڵکی تۆمەتبار

ئەکەن بە زینا بەبێ ئەوەی کە چوار شایەتیان هەبێت [ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ] وە ئەم کەسانە لە فەرمان و گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوونە..؟!

٨–(فاسق بنبأ) واتە: (قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦﴾ [الحُجُرَات : ٦] واتە: {دڵنیا بوون لە هەواڵ} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ] ئەی باوەڕداران ئەگەر کەسێکی فاسق و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە هەواڵێکی بۆ هێنان ئێوە تەبەیون و تەثبوت بکەن و پەلە مەکەن لە بڕیاردانددا تا دڵنیابن کە ئەو هەواڵە ڕاستە چونکە دواتر لەوانەیە کەسانێك بە نەزانی تووشی زەرەرو زیان بکەن وە هەڵەتان لێ ڕووبدات وە دواتریش پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردووتانە، کە وتراوە: لەسەر (وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط) دابەزیوە کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناردوویەتی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی (بەنی موستەلیق)..؟!

٩–(يهلك) واتە: ئەو کەسانەی خۆیان تووشی هیلاکەت کردووە، یان لە سنووری (خوای گەورە) دەر چوونە ، فەرمانەکان جێ بەجێ ناکەن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت: قال تعالى: ﴿فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٣٥﴾ [الأَحۡقَاف : ٣٥] واتە: هـ هیچ کەسێك لەناو ناچێ تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوونە، والله أعلم..؟!

١٠– (فسوق) واتە: ئەو کەسانەی کە جنێو بە خەلکی دەدەن ، چونکە جنێودان کارێکی یەکجار ناشرین و قێزەونە ، بە هۆی ئەم جنێو دانانەیەوە مسلمانان ئازار دەدا ، یان خێزان خۆیان ئازار دەدەن یان منداڵەکانیان ، ئەم دیاردەیە باوە ئێستا لە نێو کۆمەلگای مسلمانان ، تەنانەت وای لێهاتووە لە جیاتی (سلام کردن ) لە یەکتری جنێو بە یەکتری ئەدەن ، هەر بۆیە لەم کارە ناشرینە پێغەمبەری خوا ﷺ موسلمانان لێ ئاگادار دەکاتەوە بەوەی کە ئەم کارە (فسق) کە ..؟!

لە (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((سِبابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ وقِتالُهُ كُفْرٌ )) واتە: جنێودان بە موسلمان دەرچوونە لە حەق و راستی ، جەنگ کردنیش دژی کوفرە ..؟!

بەلێ بێ گومان ئەو کەسانەی کە سیفەتی (فسق)یان هەلگرتوە زۆرن ، لە نێو کۆمەلگا ، چونکە (فسق ) بوون ، پەیوەندیەکی زۆری هەیە بە درۆکردنەوە ، یان درۆزنی لە نێو موسلمانان‌اندا ، هەر بۆیە ئەوەی سیفەتی درۆی هەلگرتووە سیفەتی (فسق)کی شی هەلگرتووە ، بەتاییەتی درۆزانان ، و گەندەلکاران و مونافیقەکان ، بێ باوەرەکان ، هەروەها ئەوانەی دژایەتی ئەم ئایینە پاکە دەکەن ، وە ئەوانەی دزو درۆزنن یان خۆیان وا نیشاندەدەن کە چاکە کارن ، بەلام ئەوانە بەس بە روالەت خۆیان نیشاندەدن ، کەچی لە ناخەوەو لە ژێرەوە نیفاق و فسق درۆزن ..؟!

# زیانی کەسی فاسق لە سەر خۆی و لە سەر کۆمەلگادا

١-کەسی فاسق بەو کارانەی کە ئەنجامی دەدات زیان بە نەفسی خۆی دەگەیەنێت و خۆی شایەنی ئاگری دۆزەخ یان موستەحەقی ئاگری دۆزەخ دەکات .

٢-کەسی فاسق هەمیشە لە نێو خەلکی دا کەسێکی بێ رێزو بێ کەسایەتیە کارو کردەوە گوفتارەکانی زۆر پیس و قێزەون و شەیتانی یە .

٣-کەسی فاسق دەرجوویی زانکۆیی یان قوتابخانەی (إبلیس)) یان شەیتانە .

٤-کەسی فاسق بۆ هەمیشە لە ناخی خۆیدا کەسێکی بێ تاقەت و بێزارە ماندوو هیلاکە ، بە هۆی ئەم کارو گوفتارە خراپانەی کە بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە .

٥-کەسی فاسق کەسێکی یاخی و سەرگەردانە بەوەی کە گوێرایەل بوونی بۆ ئایینی خوا ، چونکە یاخی بووە شوێن ووتەی شەیتان کەوتووە .

٦-کەسی فاسق بۆ کۆمەلگا کەسی ڤایرۆس و میکرۆبە ، چونکە کۆمەلگا تووشی چەندەها نەخۆشی گەندەلی فسادی بەد رەوەشتی دەکات .

٧-کەسی فاسق کەسێکی دەم پیس و دەم لووس و بێ ئەخلاق و قسە پیسە یان رەوشت پیسە ، چونکە دەبێتە مایەی ئازاردانی دەروونی خەلك .

٨-کەسی فاسق کۆکەرەوەی هەموو سیفەتێکی ناشرینە لەوانە : بێ باوەری یان کوفر کردن ، هاوبەشی بریاردان بۆ خوا ، فیتنە ئاشووب لە نێو خەلکی دا ، هەروەها بەردەوام هەولی خیانەت ناپای دەدات ، وە جێودان شەر کردن ئاژاوەنانەوە ئازاردانی چواردەوری خۆی دەدات ، چونکە بێ شەرم و بێ حەیایە ، هەر چی بێ شەرمیە ئەنجامی دەدات .

٩-کەسی فاسق هەولی فینتە ئاشووب ئاژاوەنانەوە دەدات زیان بەخەلکی دەگەیەنێت .

١٠-کەسی فاسق نەخۆشیە بۆ خۆی و بۆ خاو خێزانەکەی و کۆمەلگاکەی ، یان چواردەوری خۆی ، هەر بۆیە پێویستە ئەم جۆرە فاسقانەی ئۆقرەیان لێ ببردرێت بنبر بکرێن ، دەریان کەین لە چواردەوری خۆمان ، چونکە زیان دەگەیەنن بە هەموو کۆمەلگادا .

# درۆكردن يەكێكە لە تاوانە گەورەكان

بەلىّ هەندێك لە تاوانە گەورە كان كە پێغەمبەرى خوا ﷺ ئێمەى لىّ ئاگادار كردۆتەوە ، بەوەى هەر كەسێك ئەنجامى بدات ، دۆزەخى بۆ خۆى مسۆگر كردووە ، وە شوێنى لە ئاگرى دۆزەخ بۆخى دەست نيشان كردووە ، هەر بۆيە وەكو باسمان كرد درۆ كردن يە كێكە لە تاوانە گەورە كان نابێت موسلمان لىّ نزيك ببێتەوە ، بەلكو دەبێت خۆى لىّ دوور كەوێتەوە ، چونكە كليلى هەموو خراپە كاريەكە ، وە يەكێكە لە تاوانە گەورەكان ، بۆيە دەبێت ووريابين و زال بين بەسەر نەفسى خۆمان ئەم گوفتارو كردەوە ناشرينە ئەنجام نەدەين ، هەر وەك لە چەند ئايەتێكى قورئان و فەرموودەى پێغەمبەرى خوا ﷺ دەربارەى تاوانى درۆ كردن ، ئاگادارى موسلمانان دەكاتەوە.

(خواى گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَـٰنِ وَٱجْتَنِبُواْ قَوْلَ ٱلزُّورِ ۝٣٠﴾ [الحَج : ٣٠] واتە: [ فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ ] ئێوە خۆتان دووربخەنەوە لەو بتە پيسانە بەوەى كە دەستبەرداريان بن و وازيان لىّ بێنن و نەيانپەرستن و ئيمان بەخوا بێنن [ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ ] وە خۆتان دووربخەنەوە لە قسەى پووچەڵ و بەتاڵ و بىّ بنەما، يان لە شايەتى ناحەق.

لە ( أبو بكرة نفيع بن الحارث ) – خوا لىّ رازى بێت – لە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبائِرِ قُلْنا: بَلَى يا رَسولَ اللَّهِ، قالَ: الإشْراكُ باللَّهِ، وعُقُوقُ الوالِدَيْنِ، وكانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فقالَ: ألا وقَوْلُ الزُّورِ، وشَهادَةُ الزُّورِ، ألا وقَوْلُ الزُّورِ، وشَهادَةُ الزُّورِ فَما زالَ يقولُها، حتَّى قُلتُ: لا يَسْكُتُ )) [٢٤] واتە: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ئايا هەوالتان پێنەدەم دەربارەى گەورەترين تاوانە گەورە كان ..؟! سىّ جار ئەمەى دوو بارە كردەوە " ووتيان بەلىّ ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ " فەرمووى: هاوبەشى دانان بۆ (خواى گەورە ) ، وە دەرچوون لە گوێرايەلى و ئازاردانى دايك و باوك ،ئينجا پێغەمبەرى خوا ﷺ پال كەوتبوو دانيشت فەرمووى: ئاگادار بن لەو تاوانە گەورە يە كە ووتەو قسەى درۆ و شاهيدان بە درۆ ، فەرمووى : پێغەمبەرى خوا ﷺ هەر ئەمەى دووبارە دەكردەوە ، هەتا ووتمان خۆزگە بىّ دەنگ بوو بايە ..؟! تێبينى (قول الزور ) واتە: رازاندنەوەى باتل و نيشاندانى بەحەق بە درۆ .

[٢٤]- صحيح البخاري برقم (٥٩٧٦).

(خوای گەورە) دفەرموویت: قال تعالى: ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ۝٦٠﴾ [الزُّمَر : ٦٠] واتە: {کافران و بیدعەچیان لە رۆژی قیامەت روویان رەش دەبێت} [ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُمْ مُسْوَدَّةٌ ] وە لە ڕۆژی قیامەتیش ئەوانەی کە درۆیان بۆ خوای گەورە هەڵبەستووەو شەریکیان بۆ خوای گەورە داناوەو بەناوی خوای گەورەو بەناوی دینەکەی خوای گەورەوە قسەیان کردووە دەبینیت ڕوویان ڕەشە، (ابن عباس) دەفەرمێت: (ئەهلی بیدەع و ناکۆکی و جیاوازی و پارچە پارچەیی روویان رەش دەبێت، وە ئەهلی سوننەو جەماعەیش روویان سپی دەبێت) [ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْمُتَكَبِّرِينَ] ئایا لە جەهەننەمدا شوێنی مانەوە نیە بۆ ئەو کەسە خۆبەگەورەزان و لووتبەرزانە کە خۆیان بەگەورە ئەزانی لە ئاست گوێڕایەڵی و عیبادەتی خوا؟ (واتە: بە دڵنیایی دۆزەخ شوێنی مانەوەی ئەو کەسانەیە )..؟!

بێ گومان ئەوانەی کە دۆر هەلدەبەستن بەم (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی شوێنیان لە دۆزەخ دایە لە رۆژی قیامەتدا چارەسنووسێکی زۆر خراپ چاوەریانە بە توندترین سزا ئازار دەدرێن ..؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((بَلِّغُوا عَنِّي ولو آيَةً، وَحَدِّثُوا عن بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ )) .[٢٥] واتە: لە منەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێت واتە: فەرموودەکانی من بگەیەنن با کە میش بێ ، فەرموودە لە نەوەی ئیسرائیلە وە بگێرنەوە هیچی تێدا نیە " هەر کەس بە ئەنقەست درۆ بکات بە ناوی منەوە ئەوە با لە دۆزەخدا جێگەیە بۆ خۆی دابنێ ..؟!

بەلێ لێردا بۆمان روون دەبێتەوە دوو جۆرە درۆ هەیە ، یەکەمیان : کە تاوانێکی زۆر گەورە ، ئەویش درۆ هەلبەستی بە ناوی (خوای گەورە ) ، پەنا بە خوا ، دووەمیان: ئەوەیە کە درۆ هەلبەستی بە دەم پێغەمبەری خوا ﷺ .

[٢٥]-سنن الترمذي برقم(٢٦٦٩).

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣﴾ [الزُّمَر : ٣] واتە : بە دڵنیایی خوای گەورە هیدایەتی كەسانێك نادات كە زۆر درۆزن و زۆر كافر بن.

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ٦١﴾ [آل عِمۡرَان : ٦١] واتە : ئەمە (موباهەلە)ی پێ ئەووترێ دوای ئەوە دوعا ئەكەین لە خوای گەورەو بەیەكەوە دەست بەرز ئەكەینەوەو ئەڵێین: لەعنەتی خوای گەورە لەو كەسە بێ كە درۆ ئەكات لەعنەتی خوا لە درۆزنان بێ ئەوكاتە دوعاكە جێبەجێ ئەبێ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بێن ئەم موباهەلە یە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - صلى الله عليه وسلم - بكەن زانیان كە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ڕاستگۆیەو خۆیان درۆ ئەكەن، كە ئەمە ساڵی نۆی كۆچی لەسەر گاورەكانی نەجران دابەزی ..؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إذا كذَبَ العبدُ تَباعد عنه الملكُ ميلاً من نَتَنِ ما جاء به )) .[٢٦] واتە: كاتێ بەندەیە درۆیەكی كرد مەلائیكە میلی لێی دوور دەكەونەوە لە بەر بۆنی پیسی ئەو درۆیەی ..؟!

لە (سفيان بن أسيد الحضرمي ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((كبُرَت خيانةً أن تحدِّثَ أخاكَ حديثًا هوَ لَكَ بِهِ مصدِّقٌ، وأنتَ لَهُ بِهِ كاذبٌ )) .[٢٧] واتە: گەورەترین خیانەت و ناپاكی ئەوەیە بە درۆ قسە بۆ براكەت بكەیت ، وە ئەو باوەری بە تۆ هەبێ و بەراستی بزانێ ..؟!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ )) [٢٨] واتە : نیشانەی مونافیق یان دوو روو سیانە : ئەگەر قسەی كرد درۆ بكات ، ئەگەر بەلێنیدا نەیباتەسەر ، ئەگەر ئەمانەت یان سپاردەیەكی لا دانرا خیانەت و ناپاكی لێ بكات ..؟!

---

[٢٦]-سنن الترمذي برقم (١٩٧٢).
[٢٧]-سنن ابو داود برقم (٤٩٧١).
[٢٨]-صحيح مسلم برقم (٥٩) .

لە (عبدالله بن مسعود ) ـ رضي الله عنه ـ – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدى إلى البر ، وإن البر يهدى إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وعن الكذب يهدى إلى الفجور ، وإن الفجور يهدى إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[٢٩] واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لیّ رازی بیّت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان راستگۆ بن بە راستی راستگۆیی مرۆڤ رێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش رێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە راست دەکات و بەدوایی راستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە راستگۆ تۆمار دەکریّ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەراستی دۆر مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت.؟!

لە ( معاوية بن حيدة القشيري ) – خوا لیّ رازی بیّت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ويلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ بالحدِيثِ لِيُضْحِكَ بِهِ القوْمَ فيَكَذِبُ ويلٌ لَهُ ويلٌ لَهُ )).[٣٠] واتە: هاوارو واوەیلا بۆ کەسیّ قسەیەك بگێرێتەوە و درۆ بکات بۆ ئەوەی خەلك بێنێتە پێکەنینەوە ، هاوار و واوەیلا بۆ ئەو کەسە ، هاوار و واوەیلا بۆ ئەو کەسە ..؟!

[٢٩]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).
[٣٠]-سنن الترمذي برقم (٢٣١٥

# ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی پاڵنەر بۆ درۆکردن

١–لاوازی ئیمان و باوەر .

٢–کەم بوونی زیکر و یادی (خوای گەورە ).

٣–بێ ئاگایی لە سزایی تاوانی درۆ کردن .

٤–هەواو ئارەزووەکان ، وەك : تەماحی دونیا و شهوەت بازی ، خۆشی گوزەرانی تەنها بۆ خۆی.

٥–خۆهەلکێشان و خۆ بەزل زانی یان لە خۆ بایی بوون .

٦–کەمبوونی ترس لە (خوای گەورە ) بێ ئاگایی لە زیکرو یادی (خوای گەورە) .

٧–بێ ئاگایی لەوەی کە نازانێی (خوای گەورە ) چاودێرە بەسەر قسەکانیەوە یان درۆکانیەوە.

٨–هەولدان بۆ گۆرینی راستەیەکان لە پێناوی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی دا .

٩–خۆکردنە پالەوان و خۆ هەلکێشان ، لە پێناو سەرنج راکێشان بۆ خۆی بە چیرۆك و قسەی بێ بنەما نەستەق و ناراست ،واتە: بە درۆ کردن سەرنجی خەلك رادەکێشێ بۆ خۆی .

١٠–خۆ دزینەوە لە راستیەکان و هەست نەکردن بە بەرپرسیاریەت و ئەمانەت لە نێو کۆمەلگادا.

١١–راهاتن لەسەر درۆ کردن لە تەمەنی مندالی یان لە باوانیەوە وەك نەریت و کەلتوور بۆی ماوەتەوە .

١٢–قسەی بریقەدار و زمان لووسی بۆ فیرودانی خەلکی یان سەرنج راکێشانیان بۆ لای خۆی .

١٣–خۆ بردنە پێش بردن و ماستاو چیەتی بۆ کەسانی بەر پرس و لە خۆ گەورەتر ، خۆی لە لایان شرین دەکات ، خۆی نمایش دەکات بە جۆرەها فروفێل کردن و ماستاو چیەتی .

## خوو گرتن بە درۆ كردن

بەلیٚ تاوانی خوو گرتن بە درۆ كردنەوە، زۆر كارێكی ناپەسندو بەدرەوشتیە لە نێو كۆمەلگادا ، چونكە مرۆڤ پێك هاتووە لە كۆمەلێك رەفتاور گوفتارو كرداری جوان ، وە هەندێك لەم رەفتارو گوفتارە جوانن ، بۆیە دەبێت مرۆڤی ژیر خۆی لە سەر ئەم رەفتارە و گوفتارە و كردارە جوانانە رابهێنێت ، بەلام هەندێك لە مرۆڤەكان وازیان لەم رەفتارو گوفتارە و رەوشت و ئاكاری جوان بەدوور گرتووە ، ئەم مرۆڤانە خۆیان بە بەدرەوشتی رەفتاری نەشرین و قێزەونەكانەوە گرتووە ، ئەمەش بۆ هەندێك كەس وەك خووگرتنە ، بە تایبەتی گوفتاری درۆ كردن یان جوانتر بلێن : وەك لە كوردەواری ووتراوە : تا درۆ هەبێت راستی نادركێنێت ..؟! ئینجا درۆ كردنیش چەند جۆری هەیە ، درۆ كردن لە گەل (خوای گەورە) یان درۆكردن لە گەل پێغەمبەرەكەی ﷺ ، یان درۆ كردن لە گەل موسلمانان ، وە یان درۆ كردن لە گەل خودی خۆی ..؟! بەلیٚ چەند جۆرێك لە درۆزن هەن ئەوانەی كە دوو روو یان مونافق ، ئیمان لاواز ، یان ئەو كەسانەی كە نوێژ خوێن و موسلمانن بەردەوام نوێژ دەكەن یان رۆژوو دەگرن زەكات دەردەكەن حەجی مالی (خوای گەورە ) دەكەن ، هەر كە لە حەج كردن گەرایەوە دەست دەكات بە درۆ كردن ئینجا دەلێن: حاجی درۆی كرد ..؟! بۆیە ئەو كەسانەی كە موسلمانن نابێت درۆ بكەن چونكە دەچنە رێزی مونافیقەكانەوە ، چونكە رەفتارو گفتارێكی زۆر ناشرینە ، هەموو كردەوە چاكەكانی تر كە ئەی كات ئەسرێتەوە بەم درۆكردنەوە ، هەر بۆیە ئەم كەسانە وا خەلكی تیٚ دەگەیەنن بە كردەوەكانیان ئەوان پیاو چاكن یان فەرمانەكانی (خوای گەورە) جیٚ بەجیٚ دەكەن ، وە چاوەریٚ رەحمەتی (خوای گەورە) دەكەن ، بەرەكەتیان بۆ ببارێت ،بەلام مخابن بە رەفتارو گوفتارە ناشرینەكانیان كە درۆ بلاودەكەنەوەە پێچەوانەی كردارەكانیان درۆ دەكەن ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموويێت : قال تعالى: ﴿وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٧﴾ [النُّور : ٧] واتە: وە پێنجەم جاریش ئەڵێ: لەعنەتی خوای گەورەم لێ بێت ئەگەر درۆ بكەم و ئەم قسەیەم درۆ بێت، ئەگەر ئافرەتەكە ئیقراری كردو دانی پیادا نا كە زینای كردووەو پیاوەكەی راست دەكات ئەوە حەدی خوای گەورەی بەسەردا جێبەجێ ئەكرێت و سزای قیامەت لەسەر ئافرەتەكە لائەچێت و دەبێتە كەفارەت و سڕینەوەی ئەو تاوانە، چونكە سزای دنیاو قیامەت كۆ نابێتەوە..

## سزا یان هەڕەشەكانی (خوای گەورە) لە كەسانی درۆزن

بەلێ حیكمەت و دادگەری (خوای گەورە) ئەوەیە كە لەنێوان بەندەكانی عدل و دادگەر بێت ، ئەویش پێویستە كە سزای و تۆلە لە درۆزنان بسێنێتەوە لە دونیا و لە دوارۆژ دا ، ئەگەر تەوبە نەكات و بەردەوام بێت لە سەر درۆ كردنەكەی ، چونكە وەك باسمان درۆ كردن كلیلی هەموو خراپە كاریەكە ، هەموو خراپەكاریەكانی مرۆڤ لە درۆ كردنەوە سەرچاوەی دەگرێت .؟!

ئەو سزاو هەڕەشانەی كە (خوای گەورە ) بۆ درۆزنان دایناوە :

١–جێگیر بوونیان لە بە سزاو ئازاردان لە ناو ئاگری دۆزەخدا :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ١٦﴾ [الرُّوم : ١٦] واتە: [ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا ] بەڵام ئەوانەی كە كافرو بێباوەڕ بوونە بەخوای گەورە [ وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] وە ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە [ وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ ] وە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەو گەیشتن بە ڕۆژی دوایی نەبووە [ فَأُولَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ] ئا ئەمانە لەناو سزای ئاگری دۆزەخدا ئامادەن و دەمێننەوە..؟!

٢–درۆزنان بۆ سزادان :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩] واتە: وە هەر كەسێك كە كوفری كردبێ وە ئایەتەكانی خوای گەورەی بەدرۆ زانیبێ ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و ئەچنە دۆزەخەوەو بە نەمری و هەمیشە یی تیایدا ئەمێننەوە كە خراپترین سەرەنجامە ڕووبەڕوویان ئەبێتەوە..؟!

٣–سزاو ئازار لە (الجحیم ) :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١٩﴾ [الحَدِيد : ١٩] واتە: [ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ] وە ئەوانەیشی كە كوفریان كردووەو ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و لە ئاگری دۆزەخدا بە هەمیشەیی و نەمری ئەمێننەوە..؟!

٤–سزاو ئازارێكی گەورەو ریسواو زەلیل :

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ۝٥٧﴾ [الحَج : ٥٧] واتە: وە ئەو كەسانەی كە كافر بوونەو ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە ئا ئەوانە سزایەكیان بۆ هەیە كە لەناو ئەو سزایە خوای گەورە ڕیسواو ئیهانەیان ئەكات..؟!

٥–نەفرت یان نعلەتی (خوای گەورە ) لە درۆزنان :

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٦١﴾ [آل عِمۡرَان : ٦١] واتە: ئەمە (موباهەلە)ی پێ ئەووترێ دوای ئەوە دوعا ئەكەین لە خوای گەورەو بەیەكەوە دەست بەرز ئەكەینەوەو ئەڵێین: لەعنەتی خوای گەورە لەو كەسە بێ كە درۆ ئەكات لەعنەتی خوا لە درۆزنان بێ ئەوكاتە دوعاكە جێبەجێ ئەبێ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بێن ئەم موباهەلە یە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - صلى الله علیه وسلم - بكەن زانیان كە پێغەمبەری خوا - صلى الله علیه وسلم - ڕاستگۆیەو خۆیان درۆ ئەكەن، كە ئەمە ساڵی نۆی كۆچی لەسەر گاورەكانی نەجران دابەزی ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٨﴾ [هُود : ١٨] واتە: [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] كێ هەیە زاڵمتر واتە: هیچ كەسێك ستەمكارتر نیە لەو كەسانەی كە درۆ هەڵئەبەستن بۆ خوای گەورەو بەناو خوای گەورەوە قسە ئەكەن [ أُولَئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّهِمْ ] ئا ئەمانە رووبەڕووی خوای گەورە ئەكرێنەوە لە ڕۆژی قیامەت و خوای گەورە موحاسەبەیان دەكات [ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ ] وە هەموو شایەتەكان لە مەلائیكەت و پێغەمبەران و زانایان ئەڵێن: ئا ئەمانە بوون كە لە دونیادا درۆیان بۆ خوای گەورە هەڵئەبەست و درۆیان ئەدایە پاڵ خوای گەورەو ئەیانووت: مەلائیكەت كچی خوایە، یان عیسى كوڕی خوایە، یان ئەمانە تكامان بۆ ئەكەن لای خوای گەورە [ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ] دەی نەفرەت و لەعنەتی خوای گەورە لە ستەمكاران بێ ئەوانەی كە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستن و بەناوی خوای گەورەوە قسە ئەكەن و درۆ ئەدەنە پاڵ دینەكەی خوای گەورە.؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ باسی تاوان پۆشی بۆ کرین و لێم بیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إنَّ اللهَ تعالى يُدنِي المؤمنَ،فَيضَعُ عليهِ كَنفَه وسِتْرَه من النَّاسِ،ويُقرِّرُه بذُنوبِه فيقولُ : أَتعرِفُ ذَنبَ كَذا ؟ أَتعرِفُ ذَنبَ كَذا فيقولُ : نعَم أَيْ رَبِّ،حتَّى إذا قَرَّرَهُ بذُنوبِه ورَأى في نَفسِه أنَّه قد هَلكَ،قال : فإنِّي قد سَترتُهَا عليكَ في الدُّنيا،وأنا أَغفِرُهَا لكَ اليومَ،ثم يُعطَى كتابَ حسناتِه بيمينِه. وأمَّا الكافرُ والمنافقُ فيقولُ الأشهادُ : هؤلاءِ الَّذينَ كذبوا علَى ربِّهم ألَا لَعنةُ اللهِ علَى الظَّالمينَ )) . [٣١] واتە: لە رۆژی قیامەتدا ئیمانداران لە پەروەردگاری خۆیان نزیك دەخرێنەوە ، تا وەکو بالی میهرەبانی خۆی بەسەردا دەکێشی ، دانی پیٚ دەنێت بە گوناهەکانیدا دەفەرمووێ : ئایا ئەزانیت ..؟! ئەویش دەلیٚ : ئەی پەروەردگارم دەزانم ..!! پەروەردگار دەفەرمووی: دەمن لە دونیادا سترم کردنی یان بۆم پۆشیێت ، وە ئەمرۆش لە تۆ خۆش دەبم ..!!ئینجا نامەی چاکەکانی پێدەدرێت ، بەلام کافران وبیٚ باوەران و مونافق و دوو رووەکان : لە بەر چاوی هەموو خەلکیەوە جاریان بۆ دەدرێت ..!!ئەمانە بوون کە درۆیان بەدەم (خوای گەورە ) دەکرد ..؟!

[٣١]-صحيح مسلم برقم (٢٧٦٨).

**٦-درۆزنان هەر گیز سەرفرازو سەرکەوتوو موفق نابن :**

**(خوای گەورە) دەفەرموویّت** : قال تعالى: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ۝٦٩﴾ [يُونُس : ٦٩] واتە: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئەو کەسانەی درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستن و درۆ ئەدەنە پاڵ خوای گەورە ئەوانە ڕزگارو سەرفراز نابن نە لە دونیا نە لە قیامەت..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویّت** : قال تعالى: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ۝١١٦﴾ [النَّحۡل : ١١٦] واتە: وە ئێوە لە خۆتانەوە درۆ مەکەن بەناو خوای گەورەوەو لە دینی خوای گەورەدا بڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامەو درۆ بۆ خوای گەورە هەڵبەستن و بەناو خوای گەورەوە قسە بکەن (بیدعەیش دەگرێتەوە چونکە ئەو کەسەی بیدعە دەکات و دەیهێنێتە ناو دینەکەی خوا بە ناوی خواوە قسەی کردووەو درۆی بۆ خوای گەورەو دینەکەی هەڵبەستووە) [ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ] بە دڵنیایی ئەو کەسانەی کە درۆ بۆ خوای گەورە هە ڵئەبەستن سەرفراز نابن لە دونیاو قیامەتدا لەبەر ئەوەی حەڵاڵ کردن و حەرام کردن ئیشی خوای گەورەیە..؟!

**٧-بە لەبەر چاو گرتنی دەرئەنجام و چارەنووسی درۆزنان :**

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾﴾ [الأَنْعَام : ١١] واتە: ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: بەسەر زەویدا بگەڕێن و گەشت بکەن پاشان ببینن سەرەنجامی ئەو کەسانە چی بووە کە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوەو شوێنیان نەکەوتوون سەرەنجامی ئێوەش وا ئەبێ..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٢٥]واتە: [ فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ ] ئێمەیش تۆڵەمان لێ سەندن و لەناومان بردن [ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ] دەی تەماشا بکەو بزانە ئەو کەسانەی کە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوە سەرەنجامیان چۆن بووەو خوای گەورە چۆن لەناوی بردوون..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت:** قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾﴾ [النَّحْل : ٣٦] واتە: {بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەران یەك بووە} [ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا ] وە بەدڵنیایی ئێمە بۆ هەموو کۆمەڵە خەڵك و نەتەوەیەك لە شوێنێك ژیابێتن پێغەمبەرێکمان بۆ ناردوون [ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ] ئیشی هەموو پێغەمبەران ئەوە بووە بە خەڵکەکەیان وتووە: ئەی خەڵکینە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن وە خۆتان دووربخەنەوە لە تاغوتەکان وەکو شەیتان و فاڵچیەکان و ساحیرەکان و بت و هەموو کەسێك کە بپەرسترێت و ڕازی بێت بەو پەرستنە، یان بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ پەرستنی خۆی، یان باوەڕی بە حوکمی خوای گەورە نەبێت و بە کۆنەپەرستی بزانێت، یان حوکمێکی تر بەباشتر بزانێت لە حوکمی خوا، یان یەکسانی بکات بە حوکمی خوا [ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ ] هەیان بووە خوای گەورە هیدایەتی داون لەسەر دەستی پێغەمبەران [ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ] وە هەیشیان بووە گومڕایی بەسەریاندا جێبەجێ بووە لەبەر ئەوەی شایەنی هیدایەت نەبوونە [ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ] دەی ئێوە بەسەر زەویدا بگەڕێن و پەندو ئامۆژگاری وەرگرن و بزانن سەرەنجامی ئوممەتانی پێشتر کە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە وەکو عادو ثەمودو ئەوانە چیان بەسەرهاتووەو سەرەنجامیان چۆن بووەو خوای گەورە چۆن لەناوی بردوون..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ١٣٧] واته: [ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ سُنَنٌ ] لەدوای ئەوەی کە لە جەنگی ئوحود حەفتا لە هاوەڵان کوژرا خوای گەورە دەفەرمێت: ئەم تێکشکانە بەسەر موسڵمانانی ئوممەتانی پێشتریشدا ڕوویداوە بەڵام سەرەنجام هەر بۆ موسڵمانانە [ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ] دەی ئێوە بەسەر زەویدا بگەڕێن بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری وەربگرن، وە ببینن و بزانن سەرەنجامی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوە چۆن بووەو خوای گەورە چۆن لەناوی بردوون ..؟!

بەلیٚ هەروەکو لەم چەند ئایەتی کە باس کرا ، چارەنووس سەرئەنجامی درۆزنان رەشە هەرگیز سەر کەوتوو نابن لە و درۆ و فیرودانەی خەلکی ئەوەی کە لە رابردوودا درۆزنان لە سەر زەوی تەنها بەشیان ریسوایی و زەلیلی و روو رەشی بووە ، هەر وەك: فیرعەون هامان و قارون ، وە بیٚ باوەرانی قورەیش وەکو : ئەبو جهل و ئەبو لهەب ، عتبە و شیبە ، وە کەسانی تریش لە کافرانی قورەیش ، هەروەها لە مونافقەکان وەك (عبدالله ی کوری سلول ) کەسانی تریش ، هەروەها لە جوولەکەکانی نەوەی قورەیزە ، نەوەی نەزیرو ، نەوەی قینقاع ، جوولەکەی خەیبر ، هەروەها لە گاوەرکانیش ، وە لە سەردەمەکانی تریش وە سولتانەکانی ئەمەویی و عەباسی ئەوانەی کە درۆیان لە گەل خەلکی دەکرد بە زالم ستەمکار ناویان هاتووە لە مێژووی ئیسلام دا ، هەروەها سولتانەکانی دەولەتی عوسمانیش ، کەچەندە درۆزن بوونە، وە سەردەمی سەرۆکەکان وەك (صدام حسین ) و (قەزافی ) و (حوسنی مبارك ) و (بشار ئەسد) و چەندین سەر کردەوە سەرۆك فەرمانرەوایانی جیهان ، ئەمانە ئەگەر سەرنجێکی عاقلانەو ژیرانە بدەین ،بە بەر چاوی خۆمان بینیمان کە چارەنووسیان و دەرئەنجامیان جۆن بوو..؟! لەو کاتەی کە ئەم پەرتووکە دەنووسم چارەنووسی درۆزنی هەرگەورەی جیهان بە (بشار ئەسد) کە لە وەلاتی سوریان چی بەسەر هات کە بۆ چەندین سال نزیکەی نیو سەدە دۆری کرد لە گەل خەلکەکەی بەلام دەرئەنجام خەلکەی بە چەپەلە لێدان لە وەلات دەریان کردو دەربەدەریان کرد ، وە ریسواو روو رەش زەلیل سەر شۆریان کرد ، کە چەندین تاوانی دژ بەمرۆڤ ئەنجامدابوو ، بەتایبەتی ئەو وێنە تراژیدایەی کە زۆر ترسناك بوو ، بووە باسی هەموو خەلك بەندینخانەی صیدنایا بوو ، لە رێکەوتی ٢٠٢٤/١٢/٨م بەرانبەر ١٤٤٦/٦/٨هـ دەسەلاتەکەی رووخێندرا ، چارەنووسی دیاری کرا لەدونیادا ، ئەوانەی دوای ئەویش با بیرێك بکەنەوە بەدەردی ئەو نەچن چونکە درۆزن ئەمە سەرئەنجامەکەیەتی..؟!

## دەرئەنجامی کاریگەریەکانی درۆ کردن لە سەر تاك و کۆمەلگادا

بەلیٚ قورئانی پیرۆز هۆشداری بە موسلمانان دەدات ، لە دەرئەنجامەکانی درۆ کردن لە سەر مرۆڤ خۆدی خۆی یان لە سەر تاك و کۆمەلگادا ، وە کاریگەریەکانی دۆر کردن ، رەفتارو گوفتاریٚکی زۆر کوشندەیە کە مرۆڤ دەبیٚت خۆی لیٚ بەدوور بگریٚتە چونکە کۆمەلگا ویٚران و خراپ دەکات..؟!

### یەکەم : کاریگەری درۆ لە سەر درۆزن خودی خۆی :

**١–گومرایی و سەر گەردانی :**

**(خوای گەورە) دەفەرموویٚت** : قال تعالی: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٤﴾ [الْأَنْعَام : ٢٤] واتە: [ انْظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ ] ئەی محمد- صلی الله علیه وسلم - تەماشا بکە چۆن درۆ بەدەم خۆشیانەوە ئەکەن کە لە دونیا شەریکیان بۆ خوا داناوە ئیٚستا سویٚند ئەخۆن ئەڵیٚن: ئیٚمە نەبووینە شەریکمان بۆ تۆ داناوە [ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ] وە ئەو درۆ هەڵبەستنانە کە لە دونیا ئەیانکرد هەمووی ڕۆیشت و هیچی نەما، یاخود ئەو کەسانەیشی کە ئەیانکرد بەشەریك بۆ خوا هەموویان ڕۆیشتن و هیچیان سوودیان پیٚیان نەگەیاند..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویٚت**: قال تعالی: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ ٥١﴾ [الوَاقِعَة : ٥١] واتە: پاشان ئیٚوە ئەی ئەو کەسە گومڕایانە کە باوەڕتان بە ڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوە نیە ..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویٚت**: قال تعالی: ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ٩٢﴾ [الوَاقِعَة : ٩٢] واتە: ئەمە پیٚشوازیان لیٚ ئەکریٚ و بۆ دۆزەخ ئەبریٚن وە ئاویٚکیان پیٚ ئەدریٚ کە لەوپەڕی گەرمیدا بە ئاگری دۆزەخ کوڵاوە هەموو ناوسك و پیٚستیان دەتویٚنیٚتەوە، وە زەقومیان پیٚ ئەدریٚ..؟!

**٢-لەدەستدانی دونیا و دوا رۆژ :**

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت:** قال تعالى: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا۟ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾﴾ [الأَنْعَام : ٣١] واتە: [ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ] ئەو کەسانەی کە گە یشتنیان بە خوای گەورە بەدرۆ ئەزانی و باوەڕیان بەزیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە نەبوو ئەوانە بە دڵنیایی دۆڕاون [ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً ] تا کاتێك کە قیامەت دێت لە ناکاودا [ قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ] پەشیمان ئەبنەوەو غەم و خەفەت ئەخۆن و ئەڵێن هاوار بۆ خۆمان کە ئێمە چەندێك کەمتەرخەمیمان کرد لە دونیاداو کردەوەی چاکمان نەکردو خۆمان ئامادە نەکرد بۆ ئەم رۆژی قیامەتە [ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ ] وە ئەوان قورسایی تاوانەکانیان هەڵگرتووە لەسەر پشتیان [ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ] بەڕاستی ئەو تاوانانە خراپترین شتە کە هەڵیانگرتووە..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت:** قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٩٢] واتە: [ الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْبًا كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا ] ئەوانەی کە شوعەیبیان - صلى الله عليه وسلم - بەدرۆ زانی وەك ئەوەی کە لەو شوێنەدا هەر نەبووبێتن لەبەر ئەوەی خوای گەورە ڕیشەکێشی کردن [ الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْبًا كَانُوا هُمُ الْخَاسِرِينَ ] ئەوانەی کە شوعەیبیان - صلى الله عليه وسلم - بەدرۆزانی و شوێنی نەکەوتن ئەمان زەرەرمەندی ڕاستەقینە بوون، کە پێشتر ئەوان بە موسڵمانانیان ئەووت ئەگەر ئێوە شوێن شوعەیب - صلى الله عليه وسلم - بکەون ئێوە زەرەر ئەکەن، نەخێر زەرەرمەند خۆیان بوون ئەوەتا خوای گەورە لە دونیا لەناوی بردن و لە قیامەتیش بەهەمیشەیی لە دۆزەخدان..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾﴾ [يُونُس : ٩٥] واتە: [ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ] وە لەو کەسانە مەبە کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەدرۆ زانیوە [ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] دوایی تۆ ئەبیتە کەسێکی زەرەرمەند، (پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لەو کەسانە نەبووە کە ئایەتی خوای گەورەی بەدرۆ زانیبێ بەڵکو بۆ خەڵکییە)..؟!

### ٣–پوچەل و بەتال کردنەوەی کردەوەکان :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٤٧﴾ [الْأَعْرَاف : ١٤٧] واتە: [ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ ] وە ئەو کەسانەی کە ئایەتەکانی ئێمە و رووبەڕووبوونەوەی ڕۆژی قیامەتیان بەدرۆزانی وە باوەڕیان پێی نەکرد [ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ ] ئا ئەمانە کردەوەکانیان بەتاڵ ئەبێتەوە [ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ] ئایا چاوەڕێی چ شتێکن و چ سزایەکیان ئەدرێتەوە تەنها کردەوەی خۆیان نەبێ واتە: خوای گەورە ستەمیان لێ ناکات..؟!

### ٤–روو چوونیان لە گومرایی و سەر گەردانی :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨٢﴾ [الْأَعْرَاف : ١٨٢] واتە: [ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] وە ئەو کەسانەشی کە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ ئەزانن [ سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ] ئەوە پلە پلە ئەیان بەینەوەو نیعمەتیان بەسەردا ئەڕژێنین تا تەواو لە گومڕایی خۆیاندا ڕۆئەچن بەڵام کاتێك کە ئەیانبەینەوە ئاگایان لە خۆیان نیەو لە بێئاگایدا ئەیانبەینەوە..؟!

### ٥–هیلاکەت و لە ناو چوون :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ٥٤﴾ [الْأنفَال : ٥٤] واتە: [ كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ ] وەکو سوننەتی خوای گەورە لە ئالی فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەوانیش کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەدرۆ زانی [ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ ] بەهۆی تاوانی خۆیانەوە لەناومان بردن [ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ ] وە ئالی فیرعەونمان نوقمی ئاوەکە کرد [ وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ (٥٤) ] وە هەموو ئەو گروپ و کۆمەڵانە هەموویان زاڵم و ستەمکارو کافر بوونە بۆیە خوای گەورە بردیانیەوە..؟!

## ٦–نەبوونی ڕێنموویی

**بەلێ ئەو کەسانەی درۆزنن دوو ردەکەوێنەوە لە ڕێنمووی یان نەبوونی هیدایەت ، هەروەها هیچ کات موفق نابێت ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾﴾ [الزُّمَر : ٣] واتە: [ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ] ئایا پەرستنی پاك و بێگەرد لە شیرك و ڕیا تەنها بۆ خوای گەورە نیە، (واتە: خوای گەورە، پەرستن و کردەوەیەك قبوڵ دەکات و وەردەگرێت کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو ئەنجام درابێت) [ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ] وە ئەوانەیشی کە جگە لە خوای گەورە هەندێك ئەولیاو شتی تریان داناوەو ئەیپەرستن کە پێیان بڵێی بۆچی جگە لە خوای گەورە ئەمانە ئەپەرستن [ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ] ئەوان ئەڵێن: ئێمە ئەزانین ئەمانە ئێمەیان دروست نەکردووەو ڕزق ئێمە نادەن بەڵام نایانپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە لە خوای گەورە نزیکمان بکەنەوەو شەفاعەتمان بۆ بکەن، (خەڵکی ئەم سەردەمەیش کە دەچنە سەر دارو بەردو گۆڕو پەرستگاکان کە پێیان بڵێیت بۆ ئەمانە دەپەرستن و عیبادەتیان بۆ دەکەن!؟ هەمان گومانی هاوبەشبڕیاردەرانی سەردەمی نەزانی و نەفامی دێننەوەو دەڵێن ئێمە نایانپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێت لە خوامان نزیك بکەنەوەو شەفاعەتمان بۆ بکەن، قسەو نیەت و گومان و کرداریان یەکە، وە سزایشان یەك دەبێت لە ڕۆژی قیامەت) [ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ] بە دڵنیایی خوای گەورە خۆی لە ڕۆژی قیامەت بڕیار لە نێوان موسڵمانان و کافران و موشریکاندا ئەدات لەو جیاوازی و ناکۆکییەی کە لە نێوانیاندا هەبووە لە دونیادا لەسەر دین [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ] بە دڵنیایی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێك نادات کە زۆر درۆزن و زۆر کافر بن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤۡمِنٌ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ٢٨﴾ [غَافِر : ٢٨] واتە: {باوەڕدارەكەی ئالی فیرعەون بەرگری لە موسا دەكات } [ وَقَالَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ ] وە پیاوێكی باوەڕدار كە (قیبطی) بوو، وتراوە: ئامۆزای فیرعەون بوو، لە (قیبطي)هكان تەنها ئەم پیاوە ئیمانی هێناوە لەگەڵ ئاسیای خێزانی فیرعەوندا [ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ ] ئەم پیاوە كە ئیمانەكەی ئەشاردەوەو دەری نەبڕیبوو فەرمووی: [ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ ] ئایا ئێوە پیاوێك ئەكوژن كە موسایە - صلى الله عليه وسلم - كە تەنها تاوانی ئەوەیە ئەڵێ: پەروەردگاری من (الله)یە!؟ [ وَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ رَبِّكُمْ ] كاتێك كە بەڵگەی ڕوون و ئاشكراو موعجیزەی لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هێناون، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لە لای كەعبە نوێژی دەكرد (عقبة بن أبي معيط) هات و شانی گرت و پۆشاكەكەی لوولدا لە ملی پیرۆزی و توندی كرد بۆ خنكاندنی، (ئەبو بەكری صدیق) هات و كردی بە شانیدا و پاڵیپێوەناو لە پێغەمبەری خوای - صلى الله عليه وسلم - دوور خستەوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئایا ئێوە پیاوێك ئەكوژن تەنها لەبەر ئەوەی دەڵێت تەنها الله پەروەردگاری منە؟! [وَإِنْ يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ ] وە ئەگەر درۆیش بكات زیانی درۆكەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوەو خوای گەورە سزای دەدات، (گومانی نەبوو لە راستێتی موسی - صلى الله عليه وسلم - بەڵام بۆ ئەوەی بوو تا ئەوان قەناعەت بكەن) [وَإِنْ يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُمْ بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ ] وە ئەگەر ڕاستگۆیش بێ ئەو هەڕەشانەی كە لێتان ئەكات هەندێكی ئەتانگرێتەوەو خوای گەورە لەناوتان ئەبات [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ] بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی كەسێك نادات كە زیادڕەوی بكات لە تاواندا وە زۆر درۆزن بێت، واتە ئەم وانیەو وتەو كردەوەی لەوپەڕی جوانی و چاكیدایەو ئەگەر درۆی بكردایە دەردەكەوت و خوای گەورە ئاوا هیدایەتی نادا كە هەمووتان دڵنیان لە راستگۆییدا..؟!

**٧–شوێنی نیشتەجێ بوونیان دۆزەخە بۆ هەمیشەیی :**

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت :** ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ۝٣٦﴾ [الأَعْرَاف : ٣٦] واتە : [ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا ] وە ئەو کەسانە یشی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە وە خۆیان بەگەورە زانیوە لە وەڵامدانەوەی [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] ئا ئەمانە هاوەڵی دۆزەخن بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە بەهۆی کوفر کردنیان..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت :** ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ۝١٠﴾ [المَائـِدَة : ١٠] واتە : [ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ] وە ئەوانەی کوفریان کردووە وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ] ئەمانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و ئەخرێنە دۆزەخەوە بەهەمیشەیی..؟!

**درۆزنان نە دەرگایی ئاسمانیان بۆ دەکرێتەوە لە دەچنە ناو بەهەشتەوە ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ۝٤٠﴾ [الأَعْرَاف : ٤٠] واتە: [ إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئەو کەسانەی کە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ ئەزانن وە خۆیان بە گەورە ئەزانن و شوێنی ناکەون [ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ ] ئا ئەمانە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە کاتێك کە ڕوحیان ئەکێشرێ بۆ ئەوەی ڕوحیان بەرز بکرێتەوە، یاخود دوعایان بەرز نابێتەوە، یان کردەوەیان بەرز نابێتەوە [ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ] وە ناچنە ناو بەهەشتەوە تا حوشتر نەچێتە ناو کونی دەرزییەوە، یان حەبلی ئەستور نەچێتە کونی دەرزییەوە، کە ئەمە شتێکی ئەستەمە [ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ ] وە بەم شێوازە ئێمە سزای تاوانباران ئەدەینەوە..؟!

# کاریگەری درۆ کردن لە سەر کۆمەڵگادا

بەڵێ یەکێك لە هەر کاریگەریەکانی دۆر کردن ئەوەیە کە دەبێتە لە دەستدانی متمانە لە نێو تاکە کانیکۆمەلگای موسلمانان ، هەر وەکو ئەو نموونەیەی قورئانی پیرۆز لە شوێنەواور کاریگەریەکانی درۆ کردن لە ڕووداوی (ئەفك ) کە بوختان و درۆ هەڵبەستن کرا بە سەر دایکی ئیماندااران (عائیشە ) – خوا لیّ رازی بێت – کە (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ [النُّور : ١١] واتە:

{ڕووداوی بوهتان کردن بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداران (حادثة الإفك)} [ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ ] ئەو کەسانەی کە ڕووداوی ئیفك و بوهتان هەڵبەستنیان بۆ (عائیشە)ی دایکی باوەڕداران هە ڵبەست، کە لە (بوخاری و موسلیم و سونەنەکان)دا هاتووە کە ئەم دە ئایەتە لەسەر پاکێتی (عائیشە) دابەزی، دوای ئەوەی لە یەکێك لە غەزاکاندا دوا کەوت وە (صەفوانی کوڕی موعە¬طەل)یش دواکەوت پاشان (صەفوان) (عائیشە)ی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کە مونافیقان بینیان هەردووکیان بەیەکەوە دواکەوتوونە بوهتانیان بۆ (عائیشە) کردو وتیان: لەگەڵ (صەفوان)دا زینای کردووە، جا ئەو کەسانەی کە ئەو بوهتانەیان کردو ئەو درۆیەیان هەڵبەست [ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ] کۆمەڵێك بوون لە ئێوە کە (حەسانی کوڕی ثابت و میسطە¬حی کوڕی ئوثاثەو حەمنە ی کچی جەحش) بوون و لەمانەوە بیسترا [ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ ] وا مەزانن کە ئەمە شەڕو خراپە بێت بۆ ئێوە بەڵکو بەهۆیەوە ئەجرو پاداشتی زۆر وەرئەگرن [ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ] بەڵکو ئەمە خێرو چاکەیە بۆ ئێوەو بەخێر بەسەرتاندا ئەشکێتەوەو پلەتان بەرز دەبێتەوەو خوای گەورە گرنگی و بایەخی بە (عائیشە) داو لەسەری هاتە وەڵام و بەرگری لێکردو پاکێتی دەرخست و ئایەتی لەسەر ناردە خوارەوە [ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ] وە هەر یەکێك لەوانەی کە ئەو قسەیەی کردووە بەشی خۆی تاوان هەڵئەگرێ [ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ ] بەڵام ئەو کەسەیشی کە سەرەتا بە ئیشەکە هەڵساوەو سەرپەرشتی کرد کە (عبداللە¬ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)ی سەرۆکی مونافیقان بوو [ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] ئەمە سزایەکی یەکجار گەورەی هەیە لای خوای گەورە، وە سیانەکەی تریش کە لێیان بیسترا پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - یەکی هەشتا جەڵدەی لێ دان..؟!

## گێڕانەوەی ڕووداوی (الإفك )

لە (عائیشە ) –خوا لێی رازی بێت – دە کێڕیتە وە دە فە رمووێت : ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا، أَقْرَعَ بيْنَ نِسَايِهِ، فأيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ معهُ. قالَتْ عَايِشَةُ: فأقْرَعَ بيْنَنَا فِى غَزْوَةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِى، فَخَرَجْتُ مع رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، وَذلكَ بَعْدَ ما أُنْزِلَ الحِجَابُ، فأنَا أُحْمَلُ فِى هَوْدَجِى، وَأُنْزَلُ فيه مَسِيرَنَا حتَّى إذَا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ مِن غَزْوِهِ، وَقَفَلَ، وَدَنَوْنَا مِنَ المَدِينَةِ، آذَنَ لَيْلَةً بالرَّحِيلِ فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بالرَّحِيلِ، فَمَشيتُ حتَّى جَاوَزْتُ الجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ مِن شَأْنِى أَقْبَلْتُ إلى الرَّحْلِ ، فَلَمَسْتُ صَدْرِى فَإِذَا عِقْدِى مِن جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِى فَحَبَسَنِى ابْتِغَاؤُهُ وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كَانُوا يَرْحَلُونَ لى فَحَمَلُوا هَوْدَجِى فَرَحَلُوهُ علَى بَعِيرِى الذى كُنْتُ أَرْكَبُ وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّى فِيهِ. قالَتْ: وَكَانَتِ النِّسَاءُ إذْ ذَاكَ خِفَافًا، لَمْ يُهَبَّلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، إنَّما يَأْكُلْنَ العُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ القَوْمُ ثِقَلَ الهَوْدَجِ حِينَ رَحَلُوهُ وَرَفَعُوهُ، وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الجَمَلَ وَسَارُوا، وَوَجَدْتُ عِقْدِى بَعْدَ ما اسْتَمَرَّ الجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ وليسَ بهَا دَاعٍ ولاَ مُجِيبٌ، فَتَيَمَّمْتُ مَنْزِلِى الذى كُنْتُ فِيهِ، وَظَنَنْتُ أنَّ القَوْمَ سَيَفْقِدُونِى فَيَرْجِعُونَ إلَيَّ، فَبيْنَا أنَا جَالِسَةٌ فِى مَنْزِلِى غَلَبَتْنِى عَيْنِى فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بنُ المُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ قدْ عَرَّسَ مِن وَرَاءِ الجَيْشِ فَادَّلَجَ، فأصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِى فَرَأَى سَوَادَ إنْسَانٍ نَايِمٍ، فأتَانِى فَعَرَفَنِى حِينَ رَآنِى، وَقَدْ كانَ يَرَانِى قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ الحِجَابُ عَلَيَّ، فَاسْتَيْقَظْتُ باسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِى، فَخَمَّرْتُ وَجْهِى بجِلْبَابِى، وَوَاللَّهِ ما يُكَلِّمُنِى كَلِمَةً وَلاَ سَمِعْتُ منه كَلِمَةً غيرَ اسْتِرْجَاعِهِ، حتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ ، فَوَطِئَ علَى يَدِهَا فَرَكِبْتُهَا، فَانْطَلَقَ يَقُودُ بى الرَّاحِلَةَ ، حتَّى أَتَيْنَا الجَيْشَ، بَعْدَ ما نَزَلُوا مُوغِرِينَ فِى نَحْرِ الظَّهِيرَةِ ، فَهَلَكَ مَن هَلَكَ فِى شَأْنِى، وَكَانَ الذى تَوَلَّى كِبْرَهُ عبدُ اللهِ بنُ أُبَيِّ ابنُ سَلُولَ، فَقَدِمْنَا المَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ، حِينَ قَدِمْنَا المَدِينَةَ شَهْرًا، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِى قَوْلِ أَهْلِ الإفْكِ ، وَلاَ أَشْعُرُ بشيءٍ مِن ذلكَ، وَهو يَرِيبُنِى فِى وَجَعِى أَنِّى لا أَعْرِفُ مِن رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ اللُّطْفَ، الذى كُنْتُ أَرَى منه حِينَ أَشْتَكِى، إنَّما يَدْخُلُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ فيُسَلِّمُ، ثُمَّ يقولُ: كيفَ تِيكُمْ؟ فَذَاكَ يَرِيبُنِى، وَلاَ أَشْعُرُ بالشَّرِّ، حتَّى خَرَجْتُ بَعْدَ ما نَقَهْتُ وَخَرَجَتْ مَعِى أُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ المَنَاصِعِ ، وَهو مُتَبَرَّزُنَا، وَلاَ نَخْرُجُ إلاَّ لَيْلاً إلى لَيْلٍ وَذلكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الكُنُفَ قَرِيبًا مِن بُيُوتِنَا، وَأَمْرُنَا أَمْرُ العَرَبِ الأُوَلِ فِى التَّنَزُّهِ، وَكُنَّا نَتَأَذَّى بالكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا، فَانْطَلَقْتُ أنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ، وَهى بنْتُ أَبِى رُهْمِ بنِ المُطَّلِبِ بنِ عبدِ مَنَافٍ، وَأُمُّهَا ابْنَةُ صَخْرِ بنِ عَامِرٍ، خَالَةُ أَبِى بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَابنُهَا مِسْطَحُ بنُ أُثَاثَةَ بنِ عَبَّادِ بنِ المُطَّلِبِ، فأقْبَلْتُ أنَا وَبِنْتُ أَبِى رُهْمٍ قِبَلَ بَيْتِى، حِينَ فَرَغْنَا مِن شَأْنِنَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِى مِرْطِهَا، فَقالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ

فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ ما قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلاً قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، قالَتْ: أَیْ هَنْتَاهْ، أَوْ لَمْ تَسْمَعِی ما قالَ؟ قُلْتُ: وَمَاذَا قالَ؟ قالَتْ: فأخْبَرَتْنِی بِقَوْلِ أَهْلِ الإفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا إلی مَرَضِی، فَلَمَّا رَجَعْتُ إلی بَيْتِی، فَدَخَلَ عَلَیَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَسَلَّمَ، ثُمَّ قالَ: كيفَ تِيكُمْ؟ قُلتُ: أَتَأْذَنُ لی أَنْ آتِیَ أَبَوَیَّ؟ قالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ اُرِيدُ أَنْ أَتَيَقَّنَ الخَبَرَ مِن قِبَلِهِمَا، فأذِنَ لی رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَجِئْتُ أَبَوَیَّ فَقُلتُ لِأُمِّی: يا اُمَّتَاهْ ما يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ فقالَتْ: يا بُنَيَّةُ هَوِّنِی عَلَيْكِ فَوَاللَّهِ لَقَلَّما كَانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، وَلَهَا ضَرَائِرُ ، إلاَّ كَثَّرْنَ عَلَيْهَا، قالَتْ قُلتُ: سُبْحَانَ اللهِ وَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بهذا؟ قالَتْ: فَبَكَيْتُ تِلكَ اللَّيْلَةَ حتَّی أَصْبَحْتُ لا يَرْقَاُ لی دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بنَوْمٍ ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ أَبْكِی، وَدَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ عَلِیَّ بنَ أَبِی طَالِبٍ وَاُسَامَةَ بنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الوَحْیُ ، يَسْتَشِيرُهُما فی فِرَاقِ أَهْلِهِ، قالَتْ فأمَّا اُسَامَةُ بنُ زَيْدٍ فأشَارَ علَی رَسُولِ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ بالَّذِی يَعْلَمُ مِن بَرَاءَةِ أَهْلِهِ، وَبِالَّذِی يَعْلَمُ فی نَفْسِهِ لهمْ مِنَ الوُدِّ، فقالَ: يا رَسُولَ اللهِ، هُمْ أَهْلُكَ وَلاَ نَعْلَمُ إلاَّ خَيْرًا، وَأَمَّا عَلِیُّ بنُ أَبِی طَالِبٍ، فقالَ: لَمْ يُضَيِّقِ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ، وإنْ تَسْأَلِ الجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ، قالَتْ: فَدَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ بَرِيرَةَ فقالَ: أَیْ بَرِيرَةُ هلْ رَأَيْتِ مِن شیءٍ يَرِيبُكِ مِن عَائِشَةَ؟ قالَتْ له بَرِيرَةُ: وَالَّذِی بَعَثَكَ بالحَقِّ إنْ رَأَيْتُ عَلَيْهَا أَمْرًا قَطُّ أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا، أَكْثَرَ مِن أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ، تَنَامُ عن عَجِينِ أَهْلِهَا، فَتَأْتِی الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ، قالَتْ: فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ علَی المِنْبَرِ، فَاسْتَعْذَرَ مِن عبدِ اللهِ بنِ اُبَیٍّ ابْنِ سَلُولَ، قالَتْ: فَقالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ وهو علَی المِنْبَرِ: يا مَعْشَرَ المُسْلِمِينَ مَن يَعْذِرُنِی مِن رَجُلٍ قدْ بَلَغَ أَذَاهُ فی أَهْلِ بَيْتی فَوَاللَّهِ ما عَلِمْتُ علَی أَهْلِی إلاَّ خَيْرًا، وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلاً ما عَلِمْتُ عليه إلاَّ خَيْرًا، وَما كانَ يَدْخُلُ علَی أَهْلِی إلاَّ مَعِی فَقَامَ سَعْدُ بنُ مُعَاذٍ الأنْصَارِیُّ، فقالَ: أَنَا أَعْذِرُكَ منه، يا رَسُولَ اللهِ، إنْ كانَ مِنَ الأوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ وإنْ كانَ مِن إخْوَانِنَا الخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ، قالَتْ: فَقَامَ سَعْدُ بنُ عُبَادَةَ وهو سَيِّدُ الخَزْرَجِ، وَكانَ رَجُلاً صَالِحًا، وَلَكِنِ اجْتَهَلَتْهُ الحَمِيَّةُ ، فقالَ لِسَعْدِ بنِ مُعَاذٍ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللهِ لا تَقْتُلُهُ، وَلاَ تَقْدِرُ علَی قَتْلِهِ فَقَامَ اُسَيْدُ بنُ حُضَيْرٍ، وَهو ابنُ عَمِّ سَعْدِ بنِ مُعَاذٍ، فَقالَ لِسَعْدِ بنِ عُبَادَةَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللهِ لَنَقْتُلَنَّهُ فإنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ المُنَافِقِينَ فَثَارَ الحَيَّانِ الأوْسُ وَالْخَزْرَجُ حتَّی هَمُّوا أَنْ يَقْتَتِلُوا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، قَائِمٌ علَی المِنْبَرِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ يُخَفِّضُهُمْ حتَّی سَكَتُوا وَسَكَتَ، قالَتْ: وَبَكَيْتُ يَومِی ذلكَ لا يَرْقَاُ لی دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بنَوْمٍ ، ثُمَّ بَكَيْتُ لَيْلَتی المُقْبِلَةَ لا يَرْقَاُ لی دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بنَوْمٍ وَأَبَوَایَ يَظُنَّانِ أنَّ البُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِی، فَبيْنَما هُما جَالِسَانِ عِندِی وَأَنَا أَبْكِی اسْتَأْذَنَتْ عَلَیَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأنْصَارِ، فأذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِی، قالَتْ: فَبيْنَا نَحْنُ علَی ذلكَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّی اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَسَلَّمَ، ثُمَّ جَلَسَ، قالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِندِی مُنْذُ قيلَ

لى ما قيلَ، وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا لا يُوحَى إِلَيْهِ فى شَأْنِى بشىءٍ، قالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ حِينَ جَلَسَ، ثُمَّ قالَ: أَمَّا بَعْدُ يا عَايِشَةُ، فإنَّه قدْ بَلَغَنِى عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فإنْ كُنْتِ بَرِيئَةً، فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وإنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِى اللَّهَ وَتُوبِى إِلَيْهِ، فإنَّ العَبْدَ إذَا اعْتَرَفَ بذَنْبٍ، ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عليه قالَتْ: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، مَقالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِى حتَّى ما أُحِسُّ منه قَطْرَةً، فَقُلتُ لأَبِى: أَجِبْ عَنِّى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فِيما قالَ فَقالَ: وَاللَّهِ ما أَدْرِى ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ فَقُلتُ لِأُمِّى: أَجِيبِى عَنِّى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَقالَتْ: وَاللَّهِ ما أَدْرِى ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَقُلتُ وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ القُرْآنِ إنِّى وَاللَّهِ لقَدْ عَرَفْتُ أَنَّكُمْ قدْ سَمِعْتُمْ بهذا حتَّى اسْتَقَرَّ فى نُفُوسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ به، فإنْ قُلتُ لَكُمْ إنِّى بَرِيئَةٌ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ لا تُصَدِّقُونِى بذلكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بأَمْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُونَنِى وإنِّى، وَاللَّهِ ما أَجِدُ لى وَلَكُمْ مَثَلاً إلاَّ كما قالَ أَبُو يُوسُفَ {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ المُسْتَعَانُ علَى ما تَصِفُونَ}. قالَتْ: ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ علَى فِرَاشِى، قالَتْ: وَأَنَا، وَاللَّهِ حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ مُبَرِّئِى ببَرَاءَتِى، وَلَكِنْ، وَاللَّهِ ما كُنْتُ أَظُنُّ أَنْ يُنْزَلَ فى شَأْنِى وَحْىٌ يُتْلَى، وَلَشَأْنِى كانَ أَحْقَرَ فى نَفْسِى مِن أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ بأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنِّى كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ فى النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِى اللَّهُ بهَا، قالَتْ: فَوَاللَّهِ ما رَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ مَجْلِسَهُ، وَلاَ خَرَجَ مِن أَهْلِ البَيْتِ أَحَدٌ حتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ علَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فأخَذَهُ ما كانَ يَأْخُذُهُ مِنَ البُرَحَاءِ عِنْدَ الوَحْيِ ، حتَّى إنَّه لَيَتَحَدَّرُ منه مِثْلُ الجُمَانِ مِنَ العَرَقِ، فى اليَومِ الشَّاتِ، مِن ثِقَلِ القَوْلِ الذى أُنْزِلَ عليه، قالَتْ: فَلَمَّا سُرِّىَ عن رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، وَهو يَضْحَكُ، فَكانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بهَا أَنْ قالَ: أَبْشِرِى يا عَايِشَةُ أَمَّا اللَّهُ فقَدْ بَرَّأَكِ فَقالَتْ لى أُمِّى: قُومِى إلَيْهِ، فَقُلتُ: وَاللَّهِ لا أَقُومُ إلَيْهِ، وَلاَ أَحْمَدُ إلاَّ اللَّهَ، هو الذى أَنْزَلَ بَرَاءَتِى، قالَتْ: فأنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {إنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بالإفْكِ عُصْبَةٌ مِنكُم} عَشْرَ آيَاتٍ فأنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ بَرَاءَتِى، قالَتْ: فَقالَ أَبُو بَكْرٍ وَكانَ يُنْفِقُ علَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ منه وَفَقْرِهِ: وَاللَّهِ لا أُنْفِقُ عليه شيئًا أَبَدًا بَعْدَ الذى قالَ لِعَايِشَةَ فأنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {وَلاَ يَأْتَلِ أُولو الفَضْلِ مِنكُم وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِى القُرْبَى} إلى قَوْلِهِ: {أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ}. قالَ حِبَّانُ بنُ مُوسَى: قالَ عبدُ اللهِ بنُ المُبَارَكِ: هذه أَرْجَى آيَةٍ فى كِتَابِ اللَّهِ. فَقالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ إنِّى لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِى، فَرَجَعَ إلى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتى كانَ يُنْفِقُ عليه، وَقالَ: لا أَنْزِعُهَا منه أَبَدًا. قالَتْ عَايِشَةُ: وَكانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ سَأَلَ زَيْنَبَ بنْتَ جَحْشٍ، زَوْجَ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ عن أَمْرِى ما عَلِمْتِ؟ أَوْ ما رَأَيْتِ؟ فَقالَتْ: يا رَسُولَ اللهِ، أَحْمِى سَمْعِى وَبَصَرِى، وَاللَّهِ ما عَلِمْتُ إلاَّ خَيْرًا. قالَتْ عَايِشَةُ: وَهى الَّتى

كَانَتْ تُسَامِينِى مِن أَزْوَاجِ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَعَصَمَهَا اللَّهُ بالوَرَعِ، وَطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ بنْتُ جَحْشٍ تُحَارِبُ لَهَا، فَهَلَكَتْ فِيمَن هَلَكَ. )) .[٣٢]

واته: كاتىٚ پێغەمبەرى خوا ﷺ بچوو بايه بۆ گەشت و سەفەر ، له نێوان ژنەكانيدا كاميان پشكى بەر كەوتايه پێغەمبەر ﷺ له گەل خۆيدا دەى برد ، (عائيشه) دەلىٚ . يەكێك له خێزانەكانى تيرو پشكى كردوو من دەرچووم ، منيش له خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ رۆيشتم ، ئەمەش پاش دابەزينى ئايەتى (حجاب) ،من لەو گەشت و سەفەرەدا كه له ناو گەژاوەكەمدا هەلدەگيرام و دادەنرام ، كاتىٚ پێغەمبەرى خوا ﷺ له غەزايەكەى يان جەنگه كەى بوويەوه بريارى گەرانەوەى دا و له شارى مەدينه زيك بووينەوه ، شەوێكيان بريارى رۆيشتنى دا ، منيش لەو كاته رۆيشتم له سوپاكه دوور كەوتمەوه تا كاتىٚ پێويستى سەر ئاوم ئەنجامدا ، گەرامەوه بۆ لاى كۆچ و بارەكه دەستم دا له سينگ و بەرۆكم ، سەير دەكەم ملوانكەيەكم كه له مۆروى (زفار )بوو پچرا بوو ، بۆيه گەرامەوه بەدواى ملوانكەكەمدا دەگەرام ، ئينجا ئەو گەرانه دواى خستم ، ئەو چەند كەسەى كه كەژاوەكەى منيان باردەكرد ، گەژاوەكەيان هەلگرتبوو خستبوويانه سەر ئەو ووشترەى كه من سوارى دەبووم ، وايان دەزانى بوو كه منى تێدايه ، ئەو كاتيش ژنان سووكەله بوون ئەوەنده قەلەو و گۆشتن نەبوون ، كەم خۆر بوون هەر ئەوەندەيان دەخوارد كەپێى بژين ، ئەو خەلكەش كاتىٚ گەژاوه كەيان هەلگرتبوو وه بەرزيان كرد بۆوه هەستيان به سووكى گەژاوەكه نه كردبوو ، منيش ئافرەتێكى تازه سال و تازه پێگەيشتوو بووم ، ووشترەكەيان هەستاندبوو رۆيشتبوون، منيش ملوانكەكەم دۆزيەوه دوايى ئەوه سوپاكه بەرێكەوتبوو ، كه هاتمەوه هەوارگه كەيان سەير دەكەم كەسى تێدا نەماوه ،منيش گەرامەوه بۆ ئەو شوێنەى كه تێدا بووم ،وامزانى خەلكەكه بۆم دەگەرێن و دێنەوه به دوامدا ، له كاتێك دا كەمن دانيشتبووم ،له شوێنى خۆما خەو زۆرى بۆ هێنام و خەوم لێكەوت ، (صفوانى كورى معطل السلمي ) له دوايى سوپاكه سەر خەوى شكاندبوو، له كۆتايى شەودا كەتبووه رىٚ ، دەمەو بەيان گەيشتبووه شوێنەكەى من ، تارمايى زەلامێكى خەوتوو بينى بوو هات بۆ لام و ناسيبوومى ، چونكه پێش فەرز كردنى حيجاب منى بينى بوو ...

---

[٣٢] -صحيح مسلم برقم (٢٧٧٠).

منیش بەدەم (إنا الله وإنا إليه راجعون )ی ئەوەوە خەبەرم بوویەوە ،کاتێ منی ناسیەوە ، بەپەل و کت و پر بە چمکی چار شێوەکە رووخسارم داپۆشی ، بە خوا نەهیچ قسەیەکی لەگەل کردم و نەهیچ ووشەیەکەم لێ بیست جگە لە (إنا الله وإنا إليه راجعون ) ە کەی . یەکسەر ووشترەکەی یخ کرد پێمی لەسەر دەستی داناو منیش سواری بووم ، جلەوی ووشترەکەی گرت و هێنامی تا گەیشتنەوە بە سووپاکە ، پاش ئەوەی لە جرقەی نێوەرۆدا لە بەر گەرما لایاندابوو ، ئەوەشی دەمی وەردا لەو باسەی من تیاچوو، ئەوەی پشکی هەر گەورەی بەر کەوت لەم رووداوە(عبدالله کوری ئوبەی کوری سلول )بوو ، کاتێك گەراینەوە بۆ شاری مەدینە بۆ ماوەی مانگێك نەخۆش کەوتم ، توومەس خەلکی هەر قسەی بوختان چیە کان ئەم بەرو ئەو بەری پێدەکەن ، وە منیش ئاگام لە هیچ نیە و هەستی پێناکەم ، بەلام لەدوایی دا کەوتمە گومانەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سۆزو بە پەرۆشەی جارانی بۆم نەمابوو کە لە کاتی نەخۆشیما لێم دەدی ، بەلکو هەر ئەمەندە نەبێت کە کاتێ دەهاتە ژوورەوە سەلامی دەکردوو ، دەیفەرموو(نەخۆشەکەتان حالی چۆنە ..؟! ) منیش ئەمە دەیخستمەگومانەوە و ، هەستیشم بە هیچ خراپەیەك نە دەکرد ، تاوەکو شەوێکیان پاش ئەوەی کەمێك باش بوو بووم ، لەدایکی (مستع ) چووین بۆ سەر ئاو کردن ، ئەوە شوێنی دانیشتن مان بوو ، شەواوشەو دەردەچوون بۆ سەر ئاو ، ئەمەیش پێش ئەوەی سەر ئاو دروست بکەین لە نزیك مالەکانماندا ، کارو پیشە کان وەك پیشەی عەرەبە پێشووەکان لە چوونە سەر ئاودا ، حەزمان نەدەکرد لە ئاودەست لە پال مالەکانماندا دروست بکەین، من و دایکی (مستع ی کچی ابراهیم کوری عبدالمتلب کوری عبدالمناف ) بوو ، دایکیشی کچی (صخر کوری عامر ) بوو ، پووری (ابو بکر صدیق ) بوو – خوا لێ رازی بێت – کورەکەشی (مستع کوری ئەساسە ی کوری عبدی کوری عبدالمتلب ) بوو ، من و دایکی (مستع) کاتێ سەر ئاو مان کرد هاتین بەرەو رووی مالەکەی من ، دایکی (مستع) پێی لە دامێنی کراسەکەی هەلکەوت و ووتی : ( دەك بەت بەخت بێ (مستح ) ، منیش ووتم : خراپت ووت ..! !نزا لە کەسێك دەکەیت کە ئامادەی غەزای بەدر بووە ، ئەویش ووتی : ئەی داماوی باوان شێواو ، ئەی نەت بیستووە چی دەلێت ..؟! منیش ووتم : چی ووتووە ..؟! دەلێ : ئیتر دەنگ باسی بوختان چیە کانی بۆ گێرامەوە ، منیش ئەوەندەی تر نەخۆش کەوتم ...

كاتێ گەرامەوە بۆ مالەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام سەلامی كردو فەرمووی: (ئەخۆشەكەتانە چۆنە ) منش ووتم : رێگەم دەدیت بچمەوە بۆلای دایك و باوكم ، دەم ویست لە رێگەی ئەوانەوە دلنیا بم لەو هەواڵە ، پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەی دام ، منیش هاتمەوە بۆلای دایك و باوكم ، بەدایكم ووت: دایكە خەلكی چی دەلێن ..؟!ووتی : ئەی كچۆلەی خۆم گوێ مەدەرێ ، بە خوا كەم رێكەوتووە ژنێكی جوان لە لای پیاوێك بێت و خۆشی بوێت ، وە سەر بە هەوێ بێت و قەسەی زۆری لەسەر نەكرێ ، ووتم : سبحان الله خەلكی ئەم قسەیان كرد..؟! دەلێ . ئەو شەوە تا بەیانی گریام فرمێسكم رانەدەوەستا یان نەدەنیشتەوە ، خەو لە چاوم نەدەكەوت ، بۆ بەیانیش هەر دەگریام ، لەو ماوەیەدا وەحی دواكەوت ، پێغەمبەری خوا ﷺ (علی كوری ئەبو تالیب ) و (ئەسامەی كوری زید) — خوا لێیان رازی بێت — بانگ كردبوو وە راوێژی پێكرد بوون سە بارەت بە واز هێنان بە خێزانی ..!!(ئەسامە ) ئاماژەی پێ كردبوو بەوەی كە دەیزانی لە پاكیەتی خێزانی ، بەو خۆشەویستیەش كە دەیزانی لەدلی دا هەیە ، بەرانبەر بە خێزانی ، ووت بووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانی خۆتە ئێمەش لە چاكە بەو لاوە هیچمان لێ نەبینیوە ، (علی كوری ئەبو تالیب )یش ووتبووی : خۆ خوا تەنگی زەوی لێنە هێناوەتەوە یەك خۆ ژنانی تر جگە لەو زۆرن ، ئەگەر بش چیتە لای كارەكەرەكەی راستیت پێ دەلێت ..!! دەلێ : پێغەمبەری خوا ﷺ (بریرە)ی بانگ كرد دەیفەرمووێت : ئەی (بریرە ) هیچ شتێكت لە (عائیشە ) بینیوە كە بتخاتە گومانەوە ، (بریرە) دەلێت : سوێند بەو كەسەی تۆی بەراستی رەوانە كردووە ، هەر گیز هیچ شتێكم لێ نەبینیوە كەلێی بە عەیب بگرم ، ئەوەندە نەبێ كە ئەو ئافرەتە یان كچە مندالكاری تازە پێگەیشتووە ، لە مالەوە بەسەر هەویرەكەی دا خەوی لێدەكەوێت ، مەرو مالات دێت هەویرەكەی دەخوات ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر ، هەندێك گلەیی و گازەندەی لە (عبدالله كوری ئوبەی كوری سلول) كرد ، فەرمووی: ئەی كۆمەلی موسلمانان كێ هەیە پشتم بگرێت لە دژی پیاوێك كە ئەزیت و ئازاری بۆم گەشتۆتە خاو خێزانیشم ، بە خوا من لە خاو خێزانی خۆم چاكە نەبێت هیچ شتێكی دیكە یان لە بارەوە نازانم ، باسی پیاوێكیش دەكەن خێر نەبێت هیچ شتێكی لە بارەوە نازانم ، لە خۆما نەبێت نەهاتۆتە مالەوە ...!!

(سعدی کوری معاز ئەنصاری ) — خوا لێ رازی بێت — هەستاو ووتی : من پشتت دەگرم لە دژی ، ئەگەر لە (اوس ) ە دەدەین لە گەردنی ، ئەگەر لە برا (خەزرەجی ) یەکانیشمان چۆن فەرمان مان پێ دەفەرمووی : ئێمەش فەرمانەکەت بەجێ دەهێنین ، دەلێ : (سعدی کوری عبادە ) هەستاو کە سەرۆکی (خەزرەج ) بوو پیاوێکی باش بوو ، بەلام دەمار گرتی و ووتی : درۆت کرد نایکوژی ناشتوانیت بی کوژی ..!! (ئەسیدی کوری حضیر ) یش ئامۆزای (سعدی کوری معاز ) بوو ، هەستا ووتی : هەر دەبێت بی کوژین ، چونکە تۆ دوو روویت پاساو بۆ دوو رووەکان دەهێنیتەوە ، هەروەها هەردوو هۆزەکە لە (اوس ) و (خەزرەج ) بۆ بە کێشەیان تێك هەلچوون تا خەریك بوو دەست بدەنە یەکتری شەرو جەنگ بکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەر مینبەرەکەیەوە خەریك بوو بێ دەنگی دەکردن ، تاکو بێ دەنگ بوون ، ئەویش بێ دەنگ بوون ، دەلێ : ئەو رۆژە منیش هەر دەگریام فرمێسکم نەدەنیشتەوە و چاوم نەچووە خەو ، پاشان بۆ شەوی داهاتووم بە بەردەوامی دەگریام ، فرمێسکم نەدەنیشتەوە و چاوم نەچووە خەو ، باوك و دایکشم وا گومانیان دەبرد کە گریان جەرگم دەبرێت ، لە کاتێکدا ئەوان هەردووکیان لە لام دانیشتبوون ، منیش دەگریام ژنێکی (ئەنصاری ) داوای مۆلەتی هاتنە ژوورەوەی کرد بێت بۆ لای من ، دانیشت دەستی کرد بە گریان ، دەلێ : لە کاتێك بەو حالە دانیشتبووین ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوەو سەلامی کرد ، پاشان دانیشت ، دەلێ : لەو کاتەوە کە ئەوە بەرانبەرم ووترا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لام دانیشت بوو ، ماوەی مانگێك هیچ وەحیەکی دەربارەی من بۆ نەهاتبوو ، دەلێ : ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوای شایەتمانی هێنا ، فەرمووی : ئەی (عائیشە ) من لە بارەی تۆوە ئەوە و ئەوەم پێگەیشتووە ، جا ئەگەر تۆ پاکیت ئەوا خوای بالادەست پاکیت دەردەخات ، خۆ ئەگەر لە گوناهێکیش نزیك کەوتویتەوە ، داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکەو توبە بکە ، چونکە بەندە گەر کاتێ دانی نا بە گوناهێك پاشان توبەی کرد خوا توبەکەی لێ وەردەگرێت ، دەلێ : پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکانی تەواو کرد ، فرمێسکم ووشکی کرد ، تاوەکو هەستم بە دلۆپێك نەکرد لێی بە باوکم ووت : لە جیاتی من وەلامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە ، ئەویش ووتی : بە خوا نازانم چ وەلامێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەمەوە ، ئینجا بە دایکمم ووت : لە جیاتی من وەلامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە ، ئەویش ووتی : بەخوا نازانم چ وەلامێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەمەوە ...

منیش ووتم : لە کاتێکدا کەمن ئافرەتێکی مندال کاریش بووم ، قورئانیشم زۆز نەدەزانی ، بە خوا من چاك دەزانم ئەمەی کە بیستووتانە بە تەواوەتی لە دلتانا جێگیر بووە وە باوەرتان پیێ کردووە ، جا ئەگەر پێتان بلێم من پاکم خوایش دەزانیێ من پاکم ، بەوە باوەرم پێناکەن ، خۆ ئەگەر دانیش بە شتێکدا بنێم بۆتان ، کە خوایش چاك دەزانێت کە من پاکم باوەرم پێدەکەن ، بەخوا من هیچ نموونەیەکم دەست ناکەوێت بۆ خۆم و خۆشتان ، مەگەر هەر ئەوەی نەبێت کە باوکی یوسف فەرمووی : (فصبر جمیل والله المستعان على ما تصفون ) دەلیێ : پاشان رووم وەرگێرا لە سەر جێگاکەی خۆم پال کەوتم ، دەلیێ : بەخوا ئەوکاتە چاك دەمزانی کەمن پاکم ، و خوایش بە پاکی خۆم پاکیم دەردەخات ، بەلام باوەرم نەدەکرکی خوا لەو بارەیە وەحی بنێرێت و بخوێنرێتەوە ، خۆم لا بچووکتر بوو لەوەی کە خوای بالادەست لە بارەمەوە بێتە گوفتار ..! !بەلام من ئومیدم وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێك ببینێت ، خوا بەم هۆیەوە پاکیم دەربخات ، بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە جێگای خۆ نەجوولا وە کەسیش لە مالەکەی دەرنەچوو بوون ، تاوەکو خوا وەحی نارد بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ترس و لەرزەی کە لەکاتی دابەزینی وەحی دا دای دەگرت ، لەوێشدا دایگرت ، تاوەکو بەرادەیەك وەکو وورده مرواری ئارەقەی لیێ دەچۆرا ، لە رۆژی سەرماو سۆلەی زستاندا ، لەقورسای سەختی ئەو ووشەیەی دادەبەزییە سەری ، دەلیێ : کاتیێ وەحی کۆتایی هات پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنی ، یەکەم ووشە کە پیێ هاتەو قسە کردن ، ئەوە بوو کە فەرمووی : ( مژدەت لێبێت ئەی (عائیشە) خوا پاکی دەرخستیت ) دایکم پێی ووتم : هەستە بەلایەوە ، منیش ووتم : بە خوا هەلناستم بەلایەوە تەنها سوپاسی ئەو خوایە دەکەم ، ئەو خوایەی کە پاکی منی دەرخست ، دەلیێ : (خوای بالادەست دە ئایەتی نارده خوارەو ، (أن الذین جاؤوا ) واتە : بیێ گومان ئەوانەی بوختانە کەیان هەلبەست دەستەیەکی بوون لە خۆتان وا ئەزانن کە ئەو بوختانە خراپ بوو بۆتان بەلکو خێر بوو بۆتان، وە (خوای گەورە ) و بالادەست بە ئایەتانە پاکی منی دەرخست ..! !

(ابو بکر صدیق ) – خوا لیّ رازی بێت – کە لەو پێش خەرجی (مستح ) دەکێشا لە بەر خزمایەتی و هەژاری و نەداریەکەی ، ووتی :بە خوا لەمەولا هەر گیز هیچ شتێکی نادەمیّ پاش ئەوەی کە بە (عائیشە) ی ووت ..؟! (خوای گەورە)ش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ، (ولا یأتل اولو الفضل ) واتە : ئەی ئەوانەی کە خاوەنی سامان و پەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن ، کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچکەران لە پێناوی خوا دا نەدەن ، با لێبردە بن و چاو پۆشی بکەن ، ئەی حەزناکەن کە خوا لێتان خۆش بێت ، خواش لێبردەو میهرەبانە ، (یەحیای کوری موسی )دەلیّ : لە (عبدالله کوری مبارك ) دەلیّ : ئەم ئایەتە هیوا بەخش ترین ئایەتە لە قورئاندا ، ئینجا (ابو بکر ) – خوا لیّ رازی بێت – ووتی : بەلیّ بەخوا من حەز دەکەم خوا لێم خۆش بێت ، هەر بۆیە گەرایەوە بۆ خەرجی کێشانی (مستح ) کە لەوە و پێش خەرجی دەکێشا ، ووتی : هەر گیز لیّ ناگرمەوە ، (عائیشە) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریشی لە (زینب ی کچی جحشی ) خێزانیشی کردبوو لەم بارەمەوە ، دا خۆ هیچی لێوە دەزانیّ یان بینیووتە ، ئەویش ووتبووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاو گوێم دەپارێزم خێر نەبێت ، هیچ شتێکی تر نازانم ، (عائیشە ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلیّ : لە ناو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دا ، ئەو لە جوانیدا هاوشانی دەکردم ، بەلام بە خۆ پارێزی و خواناسی خۆیەوە خوا پاراستی ، بەلام (حمنە)ی خوشکی هەر لە سەری دەکردەوە تا تیا چوو لە گەل ئەوانەی کە تیا چوون ..؟!

## کاریگەریەکانی درۆ کردن لە سەر کۆمەڵگا

بێگومان هەموو گەل و نەتەوەیەك درۆ کردن و درۆ هەڵبەستنی تێدایە بەڵام هێندەی لە ناو کوردەواریدا درۆ هەڵبەستن هەیە لە ناو هیچ نەتەوەو گەلێك نە بۆ تە کەلتوور ، مەبەستیش لە کەلتوور نەریت ئەوەیە کە ببێتە بەشێك لە ژیانی رۆژانەی خەڵك ، ئەویش درۆ کردن لە پێناوی ژیانی رۆژانە ، یان بۆ بەدەست هێنانی ماڵ و سامان پەلە و پۆست و بەرژەوەندی تایبەتی ، وە درۆ کردن بۆ بژیوی ژیان ئەمەیان بۆتە بەشێکی گرینگ لە فەرهەنگی کوردەواری دا ، بەڵام لەبەر نەبوونی یاسای کار پێکراو لە کۆمەڵگای کوردەواریدا درۆ هەڵبەستن بۆتە فەرهەنگی نەتەوەیی لەم زەمانەدا ، بەڵام خەڵکی ئیمانیان لاوازە گوێی نادەن بە ئەحکامە شەرعیەکانی ئیسلام ، بیر ناکەنەوەی هۆشیان ناخنەگەر نازانن درۆ کردن گوفتارێکی حەرام کراوە ، وە (خوای گەورە ) سزایی قورسی بۆ داناوە ، هەڵبەت هەرچی (خوای گەورە ) حەرامی کردبێ ئیللا حیکمەت و دانایی زۆری تێدایە ، هەر بۆیە هیچ شتێکی قەدەغەنە کردووە لە مرۆڤەکان مەگەر زیان و مەترسی نەبێت بۆی هەم لە دونیادا و هەم لە قیامەت ، درۆکردنیش یەکێکە لەو کارانەی (خوای گەورە) حەرامی کردووە ، وە لعنەت یان نەفەرتی لە درۆ زنان کردووە ، هەر بۆیە لە ئیسلامدا درۆ کردن لە ریزی تاوانە گەورە کان هەژمارکراوە ، هەر وەك ئەم فەرموودەیەی کەپێشتر باسمان کرد..؟!

لە ( أبو بكرة نفيع بن الحارث ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ألَا أُنَبِّئُكُمْ بأَكْبَرِ الكَبائِرِ قُلْنا: بَلَى يا رَسولَ اللَّهِ، قالَ: الإشْراكُ باللَّهِ، وعُقُوقُ الوالِدَيْنِ، وكانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فقالَ: ألا وقَوْلُ الزُّورِ، وشَهادَةُ الزُّورِ، ألا وقَوْلُ الزُّورِ، وشَهادَةُ الزُّورِ فَما زالَ يقولُها، حتَّى قُلتُ: لا يَسْكُتُ ))[٣٣] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێنەدەم دەربارەی گەورەترین تاوانە گەورە کان ..؟! سێ جار ئەمەی دوو بارە کردەوە " ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ " فەرمووی: هاوبەشی دانان بۆ (خوای گەورە ) ، وە دەرچوون لە گوێرایەڵی و ئازاردانی دایك و باوك ،ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵ کەوتبوو دانیشت فەرمووی: ئاگادار بن لەو تاوانە گەورە یە کە ووتەو قسەی درۆ و شاهیدان بە درۆ ، فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەمەی دووبارە دەکردەوە ، هەتا ووتمان خۆزگە بێ دەنگ بوو بایە ..؟! تێبینی (قول الزور ) واتە: رازاندنەوەی باتڵ و نیشاندانی بەحەق بە درۆ .

[٣٣]- صحيح البخاري برقم (٥٩٧٦).

کەواتە گومانی تێدانیە هەرچی (خوای گەورە ) حەرامی کردووە دەبێتە زەرو زیان و کاریگەری بۆ خاوەنەکەی و بۆ کۆمەلگاکەی ، هەربۆیە مەترسی و زیانەکانی زۆرن هەم بۆ خۆدی مرۆڤەکە یان بۆ کۆمەلگاکەی یان زیانەکانی بۆ دونیاو بۆ قیامەت ، ئەمانەی خوارەوەی کاریگەریەکانن :

١-ئەبێتە هۆی نەفرەت و لەعنەتی (خوای گەورە ) لە خودی درۆزنەکە .

٢-ئەبێتە هۆی سووتان لە ناو ئاگری دۆزەخ لە خودی درۆزنەکە .

٣-ئەبێتە هۆی هەلگری سیقەتەکانی کەسی موناقق یان دوو روو .

٤-ئەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگای یان کلیلی هەموو خراپەکاریەك ، بۆیە هەموو دەرگاکانی خراپەکاری و تاوان لەسەریدا بە روویدا کراوەتەوە.

لە (عبدالله بن مسعود ) ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدى إلى البر ، وإن البر يهدى إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وعن الكذب يهدى إلى الفجور ، وإن الفجور يهدى إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[٣٤] واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) ـ خوا لێ رازی بێت ـ دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان راستگۆ بن بە راستی راستگۆیی مرۆڤ رێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش رێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە راست دەکات و بەدوایی راستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە راستگۆ تۆمار دەکرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەراستی دۆر مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت.؟!

[٣٤]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).

٥–ئەبێتە هۆی نەمانی بەرەکەت لە رزق رۆزی و لە تەمەنیدا ، هەر بۆیە خەلکی کرین و فرۆشتن و مامەلەکانیان بە درۆ پێك دەهێنن لە دوایی دا دەرگای خراپەکانیان بۆ دەکرێتەوە .

٦–ئەبێتە هۆی بیٚ سەقەیی یان بیٚ متمانەیەی لە نێو کومەلگادا ، چونکە ئەوەندە درۆ دەکرێت لە لایەن دەست هەلاتداران و فەرمانرەوایان کردوویانە بەدیاردە لەنێو خەلکی دا ، ئیتر متمانەیان لە نێو تاکە کانی کۆمەلگادا نەهێشتووە .

٧–ئەبێتە هۆی نەمانی ئەمانەت و سپاردە لە نێو کۆمەلگادا ، هەریەك بووبە بەرپرس ئەوا یەکسەر دەست دەکات بە ناپاکی خیانەت کردن لەو ئەمانەتی کە پیٚ سپێردراوە ، گەندەلی فسادی خراپەکاری زیاد دەکات ، ئەمەش دەبێتە وێران کردنی وەلات لە دەستی ، هەروەها فساد کردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان و ژێر خانی ئابووری وەلات ، چونکە کەسی درۆزن هەمیشە لە بەرژەوەندیەکانی خۆی کار دەکات ، بە خۆی خیانەت کارو فسادو گەندەلکارە .

٨– ئەبێتە هۆی دوو دلی دلە راوکیٚ رارای و قەلەقی لە نێو تاکە کانی کۆمەلگادا ، بۆ هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەن ، هەر بۆیە باوەرو متمانە نامێنی ، کەسی درۆزن بەردەوام بە گومانی خراپ مامەلە لە گەل خەلکی دەکات ، گومانی خراپ بۆ هەموو شتێك دەبات ، متمانەی بە کەس نیە .

لە (الحسن بن علي بن ابي طالب ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((دَعْ ما يَرِيبُكَ إلى ما لا يَرِيبُكَ، فإنَّ الصدقَ طمأنينةٌ وإنَّ الكذبَ رِيبةٌ )).[٣٥] واتە : واز لەوە بهێنە کە دەتخاتە گومانەوە ، بۆ شتێك کە ناتخاتە گومانەوە ، چونکە بێگومان راستگۆیی دلنیاییە ، درۆ کردن و دەلەسەش دوو دلییە ..؟!

---

[٣٥]-سنن الترمذي برقم (٢٥١٨)

# دیاردەی درۆ کردن

بەلیٚ وەکو باسمان کرد درۆ بریتیە لە پیٚچەوانە کردنەوەی راستی ، یان شاردنەوەی زانیاری یان هەوالی راست و پیٚچەوانە کردنەوەیان بۆ درۆ کردن ، ئەمەش بۆ پەرژەوندی تاکیٚك یان کۆمەلیٚك و گروپیٚك بیٚت ، درۆ کردن بە واتایی شاردنەوە یان داپۆشینی رووی راستەقینەی سروشتی مرۆڤ دیٚت ..؟!

بەلیٚ زۆرجار کەسی درۆزن لە ئەنجامی بەرگری کردن لە درۆ کەی سەد درۆی تر بۆ خۆی دروست دەکات تاوەکو درۆی یەکەمی پیٚ بشاریٚتەوە ، یان زۆرجار کەسی درۆزن لە ئەنجامی بەرگری کردن لە درۆکەی ، کەسی درۆکەر بۆ ئەوەی راستگۆیی خۆی بسەلمیٚنیٚ و درۆکەی ئاشکرا نەبیٚت ، تووشی درۆی گەورتر دیٚت ، وە بیٚ ئومیٚدی زیاتر رووی تیٚ دەکات ، هەر بۆیە هەندیٚك کەس درۆ دەکەن بۆ پاریٚزگاری کردن لە شتیٚك یان بابەتیٚك کە جیٚگای رەخنە نارازی و توورە بوونی خەلکە ، بەلام بە گوفتارە درۆزینەکانیان ناتوانن راستیە کان بشارنەوە ، بەلکو بلیسەی ئاگری درۆ کانیان گەورەتر دەبیٚت ، یان خەرمانی درۆکانیان گەورەتر و زیاتر دەبیٚت ، راستیە کان روون دەبیٚتەوە بۆ خەلك ، هەلبەت لەم سەردەمە زۆر زووتر درۆکان ئاشکرا دەبن بۆ خەلك وە لە سەردەمەکانی پیٚشتر ، ئەمەش بە هۆی تەکنەلۆجیەی ئەم سەردەمە وەکو تۆرە کۆمەلایەتیەکان، کەسی درۆزن هەر چەندە بەهیٚزو دەسەلاتی هەبیٚت ، هەر درۆکانی ئاشکرا دەبیٚت بۆ خەلکی ، چونکە درۆ کردن بۆ بەدەست هیٚنانی هیٚزو دەسەلات یان لە پیٚناوی دەسکەوت و پلە و پۆست پایە بیٚت ، هەر گوفتارو کاور کردەوەیەکی خراپە دەرگاری خراپەکاریەکان بەرووی دا دەکرٚتەوە رووی رەش دەبیٚت لە نیٚو خەلکی دا ، درۆ کانی ئاشکرا دەبیٚت ، راستە هەموو مرڤیٚك هەمیشە هەولدەدا کە وەکو کەسیٚکی راستگۆ خۆی نمایش بکات ، خۆی وا دەردەخات خۆی رەقی لە درۆیە ، بەلام بەشیٚکی سەرەکی لە گوفتارو وعد بەلیٚنە کانمان ناراست و درۆن ، ئەوەی وعد بەلیٚن نەباتە سەر کەسیٚکی درۆزنە ، با هیچ خۆی نمایش نەکات بەلیٚت من راستگۆم ، ئەوەی ناپاکی دەکات لە پۆست پلە کەی ئەوا کەسیٚکی درۆزنە بە بانگەشەی راستی نەکات ، هەر بە درۆزنەکەیەوە بمیٚنیٚتەوە ، چونکە سیفەتی مونافق هەلگرتووە ، ئەوا باشە تەوبە بکات و ئەم رەوشتە ناشرین و قیٚزەونە لە پیٚناوی (خوای گەورە ) دا وازبهیٚنی ، خۆی لیٚ بەدوور بگریٚ ..؟!

هەربۆیە درۆ لە نێو خەلكی دا بۆ تە دیاردەو كارەساتێكی یەكجار گەورە ، هەر وەكو درۆیی تاكەكانی كۆمەلگا لە نێوە خۆیان لە لە نێو خێزانەكان ، هەروەها درۆی كاربەدەستان ،وە درۆی تۆرەكۆمەلایەتیەكان ، یان درۆیی تەلەفزیۆنەكان ، یان درۆیی بازارەكان و درۆیی چاپەخانەكان ، درۆی ژوورە تاریكەكان ، درۆیی سەر مێزە رازاوەكانی بە پرسان بۆ خەلكی ، یان درۆیی فەرمانگەكانی دەولەت ، هەر بۆیە لە كویێ ئەم وەلاتە بۆی برۆیی درۆ هەیە ، لە هەرچی شوێنێك بگری درۆ دەكرێت ، تەنانەت درۆ لە نێو مەزگەوتەكانیش دەكرێت ، مەلایەكانی ئەم سەردەمە راستەیەكان دەرناخە و حەق بێژ نێن ، لە هەر شوێنێك درۆ یەكسەر ئامادەیە و راستگۆیش بۆتە پیشەی كە سە بیێ هێزو بیێ دەسەلاتەكان و شێت و نەزانەكان ، بیێ گومان بە ووتەی خۆیان ئەوی راستگۆ بێت گێلە و نەزان و نەفام و جاهیلە لەم سەردەمە دا ، یان پیێ دەلێن : ئەم فەقیرە كەسێكی گێلە  كە ئەوەندە نەفامە راستی دەلیێ ..؟!زۆر جاریش كەسی درۆزن دەبێتە كەسی عاق و زیرك بە درۆكانیەوە لە نێو خەلكی بە لام بۆ ماوەیەكی كەم ، (خوای گەورە ) پەردەی لە سەر درۆ كانیەوە هەلدەداتەوە رووە رەشەكەی بۆ خەلكی ئاشكرا دەكات ، ئیتر ئینجا خەلكی دەست دەكەن بە تانە دەشەنە ، كەچی پێشتر بە بال و شانیان دا هەلدەدا ، هەر كەسێك (خوای گەورە) شكۆو عزەتی پیێ ببەخشیێ ئەوە هیچ كەسێك ناتوانیێ لیێ بسێنێتەوە ، ئەوەشی زەلیل و ریسوایی بكات ئەوە هیچ كەسێك ناتوانێت شكۆ و عەزەتی بداتیێ ، هەر هەمووی لەدەستی (خوای گەورە ) دایە ، هەر وەك دەفەرمووێت : ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦﴾ [آل عِمۡرَان : ٢٦] واتە: [ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ ] ئەی محمد - صلى الله علیه وسلم - بڵێ: ئەی پەروەردگار تەنها تۆ خاوەنی هەموو موڵكەكانی [ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ ] موڵك بە هەر كەسێك ئەبەخشی كە ویستت لێ بێت [ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ ] وە لە هەر كەسێكی وەرئەگریتەوە كە ویستت لێ بێت [ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ ] وە هەر كەسێك بە عیززەت ئەكەی كە وویستت لێ بێت [ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ ] وە هەر كەسێك زەلیل ئەكەی كە ویستت لێ بێت [ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ] خێرو چاكە تەنها بەدەستی تۆیە، وە بە دڵنیایی هەر تۆ تواناو دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێكدا هە یە ..؟!

هەر بۆیە درۆ کردن دیاردەیەکی زۆر خراپە ، چونکە زۆر جار مرۆڤی درۆزن تووشی شەرمەزاری گەورە دەبێت ، روو رەش و ریسوا دەبێت کاتی درۆ کەی ئاشکرا دەبێت ، هەروەها زۆر جاریش درۆزنان بۆ پەردە پۆشکردنی درۆکانیان چەندی کارەسات و نەهامەتی بۆ خەلکی دەنێنەوە ، توویی گەورەترین خراپەکاری و ستەم کردن دەبن ، بۆیە درۆزانان بۆ پەردەپۆش کردن درۆکانیان یان مەرام و مەبەست گلاوەکانیان تووشی چەندین هەلە گەورە دەبن ، دەبێتە کارەساتێکی یەکجار گەورە بۆ کۆمەلگا ، هەروەها ئنجا بە هۆی درۆکانیانەوە تووشی چەندین گرفتی چاوەروان نەکراو دەبن ، وە بۆ خۆیان و بۆ خەلکیش ، ئینجا نەهامەتی یەك لە دوایی یەك تووشیان دەبێت ، لە کۆتایی دا بۆیان پەردە پۆش ناکرێ ، کۆمەلگاو وەلات تووشی فسادی گەندەلی خراپە کاری دەبێت ، هەر بۆ یە لە کۆمەلگای کوردەواری دا چەمکی درۆ لە ناو هەموو چین توێژەکان رەنگدانەوەی گەورە و خراپی لە دەروونی خەلك تاکەکانی نێو کۆمەلگادا جێ هێشتووە ، بۆیە هەر وەك باسمان کرد درۆ بۆتە دیاردە و قەیرانێکی یەکجار گەورە لە نێو کۆمەلگادا ، ئەمەش هۆکاری بێ شەرمیە ئەم دیاردەیە روو لە زیاد بوون ، بۆیە کەسی بێ شەرم یان بێ حەیان هەرچی بکات ئەی کات ، چونکە شەرم ئابرووی نەماوە ، درۆ کردنی پێ شتێکی سادەو ئاساییە ، هەر وەکو ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی .

لە (ابو مسعود عقبە بن عمرو ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرتەوە لە پێغەمبەری خواصلی فەرموویەتی : ((إذا لم تستحِ فاصنَعْ ما شِئتَ )). [36] واتە: ئەگەر شەرم و ئابروو نەبێ ، هەر چی دەوێت بیکە..؟! واتە: ئەوەی شەرم حەیاو ئابرووی نەبێ هەرچی دەوێت دەیکات شەرمی پێنیە ، ئەوەی لە خراپەکاری مەبەستیتی ئەنجامی دەدا ، رووی نیە کە شەرم بکات لە کردەوە قێزەونەکانی ، حەیاو شەرمی نیە ئەگەر لێ ئاشکرا بێت ، لێ پرسینەوەی لە گەل بکەن ، چونکە پیاوی بێ شەرم و حویا خۆی بۆ هەموو ریسوا کردنێك ئامادە کردووە ، بۆیە هەمیشە و بەردەوام پیشەو کارو کردەوەکانی بە درۆ کردن بەرێ دەکات ، گوێی بەر ریسوایی کردن سەرزەنشت کردن نیە ، ئەگەر سەریری تۆرەکۆمەلایەتیەکان بکەین ، رۆژانە بە هەزاران درۆ و بوختان و قسە هەلبەستن دەکرێت ، بە ناوی خەلکەوە ، یان درۆ شاخ دار دەکرێت ، لە ماوەیەکی کەم درۆ کە ئاشکرا دەبێت ، بەلام کەسی درۆزن هەر گوێی پێ نادا ، کە درۆکەی ئاشکرا بووە ، چونکە بێ شەرم و بێ حەیاو بێ ئابرووە ، کەسێکی ریسواو قێزەونە ..؟!

---

[36]-صحيح البخاري برقم (٣٤٨٤).

هەر بۆیە درۆ کردن لە نێو کۆمەڵگای کوردیدا بۆ تە قەیرانێکی یەکجار گەورە ، هەر وەك درۆ کردن لە ماڵەوە لە گەل منداڵەکاندا ئەوەش هۆکاری ئەم حوکمەتیە درستی کردووە ، بە هۆی نەدانی ئەو برە پارەیەی کە بە فەرمانبەر دەدات مانگانە ، ئێستاش ساڵ بە ساڵ خراپتر بووە ، درۆ زیاتر دەکریچت جا حوکمەت لەگەل فەرمانبەرەکە ، فەرمانبەرەکەش لە گەل ژن و ماڵ منداڵی دا ، بێ گومان ئەم دیاردەیە رۆژ بە رۆژو مانگ بەمانگ و ساڵ بە ساڵ و زیاتر سەر هەڵدەداو زیاتر تەشەنە دەبێت ، لە ناو کۆمەڵگادا ، وادیانرە ئەمەش هۆکارەکەی بە پرسە گەورەکانن ، ئیجا شۆرە دەبێتەوە بۆ نێو خێزانەکان و کۆمەڵگا بەرەو درۆ کردنی زۆر دەبات ، ئەم درۆ کردنەش دەبێتە هۆکاری لە دەستدانی متمانە لە نێو خەڵکی دا ، وە خزمەت بە هیچ کەسێك ناکات ئەم هەموو درۆ کردنەی رۆژانە ، چونکە دەبێتە قەیرانی درۆ کردن ، قەیرانەکەش زیاتر دەبێت کەپ ناکرێتەوە ، گەندەڵی و فسادی بەدرەوشتی خراپەکاری زۆری بەدوا دا دێت ، بەڵێ لە پێش زۆر ئایەتمان هێناوە دەربارەی درۆ کردن بەلام ئەم ئایەتش بە بیرتان دێنمەوە ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٦١﴾ [آل عِمۡرَان : ٦١] واتە : ئەمە (موباهەلە)ی پێ ئەووترێ دوای ئەوە دوعا ئەکەین لە خوای گەورەو بەیەکەوە دەست بەرز ئەکەینەوەو ئەڵێین: لەعنەتی خوای گەورە لەو کەسە بێ کە درۆ ئەکات لەعنەتی خوا لە درۆزنان بێ ئەوکاتە دوعاکە جێبەجێ ئەبێ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بێن ئەم موباهەلەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - صلى الله عليه وسلم - بکەن زانیان کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ڕاستگۆیەو خۆیان درۆ ئەکەن، کە ئەمە ساڵی نۆی کۆچی لەسەر گاورەکانی نەجران دابەزی ..؟! بەڵێ کاتێك کە مرۆڤ درۆیەك دەکات وەك حاڵەتێك سەیر دەکرێ ، بەلام جیاوازی زۆرە لەگەل کەسێك کە بەردەوام درۆ دەکات ، بەردەوام وەعد بەڵێن دەدا نایباتەسەر ، بەردەوام درۆ بکات و کە بە درۆزن یان بە فشەکەر ناو دەردەکات ، درۆزنیش خەسلەتە و وازهێنانی زۆر ئەستەمە ، چونکە لەو حاڵەتەدا ئەگەر درۆزن قسەی راستیش بکات خەڵکی متمانەی پێناکات هەر بەدرۆزن ناو دەبرێت ، چونکە پێشتر پێشنەی زۆری درۆ کردنی هەبووە ، بۆیە کۆمەڵگای کوردی چەمکی درۆ کردنی کردۆتە بەرنامە لە گێرانەوەی شکستە مێژوویەکان و گۆرینیان بۆ سەر کەوتن ، ئەمرۆ لە سەردەمەدا ئەوانەی کە بە پرسیارنن لە کومەڵگای کوردی بێ جیاوازی ،لە نووسەران و بیرمەندان و بە رپرسان و هەموو چین و توێژەکان ، لێ بەر پرسن ، ئەمەش هەموویان پێوەری دلسۆزییان یەندە یەرێژەی زۆری ئەو درۆیانەی بۆ پینە کردنی کەموو کوریەکان ، هەر بۆیە درۆ کردنی حاڵەتێکی سروشتی نیە ، بەلکو بۆ مەبەست بۆ دیاردەیەکی رۆتنی بەر بلاو لە ناو کۆمەڵگادا..؟!

## پاڵەنەرەکان درۆ کردن و هاندان بۆ چارەسەریەکان

ئەی ئەوانەی کە موسلمانی هۆشیارو ژیرن ، دلگران نەبن بە هۆی ئەو درۆ یانەی کە لە دەوربەرە هەن یان لە ناو خێزانەکان و بە تایبەتی لە تەمەنی بچووك دا هەیە ، وەکو منداڵەکەت یان کەسە نزیکەکان ، وە یان هاوڕێ نزیکەکان ، یان ئەو کەسانەی لە کار کردندا لە گەڵدان ، یان بەر پرسەکەت یان هەر کەسێك ، کە نیازی ئەوەی هەیە ، درۆت لە گەڵدا بکات و فروفێڵت لەگەڵ بکات ، پرسیارێك لێرە دێتە ئاراوە ئایا بۆ چی دەبێت بەرانبەرەکە درۆ لە گەڵدا بکات ..؟! بەڵێ لە سەرتا دەبێت ئەوە بزانین کە درۆ کردن سیفەتێکی وەرگێراوە لە راستەوە بۆ درۆ کردن ، ئەویش لە رێگەی فێر بوون و لاسایی کردنەوەی درۆ کردن لە کەسانی خراپ یان لاسایی کردنەوەی لە باوانی بۆی ماوەتەوە ، یان تەماح و کەلەبوونی شارەزایی کەسە ..چەند پالنەری سەرەکی هەن بۆ کەسی درۆزن ، ئەمانەی خوارەوەن :

١–لاوازی ئیمان و بێ ئاگایی لە سزای درۆ.

٢–کەمبوونی زیکرو یادی (خوای گەورە) .

٣–سیفەتی دوو رووی ئەویش وەك بێ بەلێنی و ئەمانەت نەپارێزی .

٤–ترسان لە سزادان .

٥–خەون و خەیالی پرو پووچ بۆ تەماحی کەمی مالی دونیا .

٦–خەو خەیال بینین بۆ بەدەست هێنانی پلە و پۆست .

٧–غەش کردن و فروفێل کردن بۆ مەبەستی رازی کردنی بەرانبەرەکەی .

٨–زۆر فشار کردن لە سەر کەسی درۆزن ، چونکە هەر لێکۆلینەوەیەکی سادە دەست دەکات بە درۆ کردن لە جیاتی قسەی راست دروست بکات پەنا دەباتە بەر درۆ کردن .

٩–هەندێك جار کەسی درۆزن ، درۆ دەکات بۆ ئەوەی سەرنجی بەرانبەرەکەی بۆ خۆی راکێشێ.

١٠–کەسی درۆزن هەولدەدا نمایشێك ئەنجامدا بۆئەوەی سەر سورمانی بیسەران بەدەست بێنێت

١٢–کەسی درۆز هەندێك جار درۆ دەکات بۆ مەبەستی ئیرەیی رق لێ بوونەوە دوژمنایەتی.

چارەسەریەکانی کەسی درۆزن :

١–زیکر و یادی (خوای گەورە) زۆر بکات .

٢–شارەزا بوون لە شەریعەتی ئاینی ئیسلام .

٣–شارەزا بوون لە حکم سزای درۆزن لە قورئان و فەرموودە .

٤–دانیشتن لە مجلیسی علم و زانستی شەرعی .

٥–دۆستایەتی کردنی کەسی راستگۆ و ئیماندار .

٦–دوور کەوتنەوە لەهەموو ئەو شتانەی کە (خوای گەورە) حەرام و قەدەغەی کردوون .

٧–زۆر قورئان خوێند بە تێگەیشتنەوە ، بەتایبەتی ئەو ئایەتانەی دەرباری درۆ کردن دابەزیووە.

٨–متمانەی بە نەفسی خۆی بێت ، دان بەو راستیە یان واقیعە دابنێ کە بەو ژیانەی تیادا دەژیت.

٩–هەولدان بۆ بەدەست هێنانی ئیرادەی بەهێز ، ئەویش ئەوەیە بۆ هیچ شتێك درۆ نەکات .

١٠–نابێت هیچ کات کەسی درۆزن ، بە درۆزن بانگ بکرێت ، لەبەر ئەوەی نەوەك خووی پێوە بگرێت و بەردەوام بێت لە سەر درۆ کردن ، بەلکو کاتێك کە کەسی درۆزن درۆیەکی روونی تێدا بەدیکرا ئەوا بەم جۆرە حالی بکرێت کە درۆ نەکردووە،بەلکو تووشی لەبیر چوونەوە بووە یان هەلەی کردووە .

١١– بەردەوام هانی راستگۆیەتی بدرێت ، بۆ ئەوەی خووی بەراستگۆیەتی بگرێت نەك درۆکردن.

١٢–پێویستە ئارام بگرین لە سەر کەسی درۆزن ، زوو هەلنەچین چونکە ئارام گرتن لە سەر درۆزن ئەوا بە خۆی دا دەچێتەوە .

## خۆ رزگار کردن لە رەوشتی درۆ کردن و هاوشێوەکانی لە قسەکردندا

یەکەم : هەست گردن بەوەی کە لە کاتی قسەکردنتدا (خوای گەورە ) بیسەر و بێنەرە ئاگایی لێیەتی لە هەرچی ووتەیە کە بە زمان دەترکێنی ، وا هەست بکەیت بەلێ ئەوا (خوای گەورە ) دەیبیسێت وە هەموو قسەو ووتەکانم تۆمار دەکرێت ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾﴾ [المُجَادلَة : ٧] واتە: { زانیاری فراوانی خوای گەورە} [ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] ئایا نابینی خوای گەورە زانیاری وردی هەیە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیەو ڕووئەدات هیچی لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە [ مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ ] هیچ سێ کەسێك نیە بەیەکەوە بە نهێنی قسە بکەن و چپە چپ بکەن ئیلا خوای گەورە چوارەمیانەو زانیاری پێیانەو ئاگای لێیانە [ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ ] وە ئەگەر پێنج بن ئیلا خوای گەورە شەشەمیانە [ وَلَا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ] یان لەو ژمارە کەمتر بن یان زیاتر بن ئیلا خوای گەورە لەگەڵیاندایە لە هەر شوێنێك بن، لەگەڵدابوونی خوای گەورە بە بیستن و بینین و زانیاری و تواناو دەسەڵات و ویستێتی، بەڵام زاتی پیرۆزی خۆی لەسەر عەرشە [ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ] پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا هەواڵیان پێ ئەدات بەو کردەوەو وتانەی کە کردوویانە بەتایبەتی ئەوەی کە چپە چپ و نهێنی بووە [ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانایە بە هەموو شتێك..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾﴾ [التَّوْبَة : ٧٨] واتە : [ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ ] ئایا مونافیقان نازانن کە خوای گەورە نهێنی و ئاشکرای ئەوان ئەزانێ و زانیاری بەهەمووی هەیە [ وَأَنَّ اللَّهَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ] وە خوای گەورە زانای هەموو نهێنیەکانەو هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾ [ق : ١٨] واتە: {هەموو وتەیەك دەنوسرێت} [ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ] هیچ وتەیەك لە دەم مرۆڤ نایەتە دەرەوە ئیلا ئەو دوو فریشتەیە چاودێرو ئامادەن و دەینوسن، یان وتراوە: یەکێکیان ناوی (رەقیب)ە و ئەوی تریان ناوی (عەتید)ە، (ئیمامی ئەحمەد) لە نەخۆشی سەرەمەرگەکەیدا نرکەنرك و ناڵەناڵی دەکرد، پێی وترا (تاوس) دەفەرمێت: فریشتە هەموو شتێك دەنوسێت تەنانەت نرکەنرك و ناڵەناڵیش، لە پاش ئەوە (ئیمامی ئەحمەد) نرکەی نەکرد تا کۆچی دوایی کرد..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٨٠] واتە: [ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ ] یاخود ئایا وا گومان ئەبەن کە ئێمە نهێنی و چپە چپی ئەوان نابیستین لە شوێنی چۆڵدا کاتێك کە کۆ ئەبنەوە [ بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ] بەڵێ ئەیبیستین وە فریشتە نێردراوەکانی ئێمە لەلای ئەوان هەموو شتێك ئەنووسن..؟!

کەواتە هەست کردن بەوەی کەوا (خوای گەورە ) هەموو قسەو ووتەکانت دەبیسێت و دەیزانێت و فریشتەکانیش تۆماری دەکەن ، ئەمە لەسەر سەر دەبێت ببێت بە رێگر لەوەی کەوا بە هیچ شێوەیەك درۆ کردن و ووتەی بیٚ سوود و قسەری خراپ و زیادەرۆیی کردن لە قسەی پر پووچ بۆ ئەوەی سەرنجی خەلکی را بکێشی خۆت بۆیان نمایش بکەی ،هەموو ئەو ووتەو قسەو گوفتارانە لەسەر هەژمار دەکرێت ئەوەی کە بە خراپە دەیان کەی وەك درۆ کردن و زیادەرەوی لە قسە کردنی ، هەروەها قسە پرو پووچ و بیٚ سەر بن ، یان ئەو قسانەی کە بۆ هیچ دانیشتێك ناکریچت تۆ بیان کەی ، وە یان لە گێرانەوەی قسە دا تۆ بچی قسەی یان درۆ بۆ زیاد بکەی ، ئەمانە هەموو پەیوەندیان هەیە بە درۆ کردنەوە ، بۆ ئەوەی خۆت رزگار بکەیت لە رەوشتی درۆ کردن ، هەولبدە چ قسەی خێرو چاکەیە ئەنجامی بدە ، چونکە لیٚ پرسینەوەت لە گەل دا دەکرێت ، لەسەر ئەوەی کە زمانت بە باش بە کار نەهێناوە ، جا چ بە درۆ کردن یان بە بوختان و یان بە قسە هەلبەستن یان بە خیانەت دوو روویی ، یان بە زیادەرۆیی لە قسەکردن وە قسەی پرو پووچ یان هیچ پووچ ، بۆیە وریابە (خوای گەورە ) بیسەرە رەقیبە و بە نهێنیەکانی دەزانی ..؟!

دووەم : ئەگەر ویست قسە بكەیت و حەزت لە قسە كردن بوو ، ئەوا یان قسەی خێر و چاكە بكە یان بێ دەنگە ببە ..؟! هەر وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مان باس دەكات .

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت– دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((من كان يؤمن بالله واليومِ الآخرِ فلْيُكرِمْ ضَيْفَه، ومن كان يؤمنُ بالله واليومِ الآخرِ فلْيَقُلْ خيرًا أو لِيَصْمُتْ )) . [37] واتە: هەر كەسێك باوەری بە خواو بە رۆژی دوایی هەبێ ، ئەوا با رێز لە مێوانەكەی بگرێت ، وە هەر كەسێك باوەری بە خواو بە رۆژی دوایی هەبێ ، قسەی چاك بكات یان بێدەنگ بێت ..؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت– دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((من صمَت نجا )) . [38] واتە: هەر كەسێك بێدەنگ بێت لە خراپە رزگاری دەبێت ..؟!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت– دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((الصَّمْتُ أرفَعُ العِبادَةِ )) . [39] واتە : بێدەنگ بوون لە قسەی پووچ گەورە ترین پەرستنە ..؟!

لە (الحسن البصرى ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – ئەم فەرموودەیە دەگێرێتەوە ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إذا سُئل الرجلُ عن أخيه فهو بالخيارِ إن شاء سكتَ وإن شاء قال فصدَق )) . [40]

لە (انس بن مالك) – خوا لێ رازی بێت– دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((الصَّمتُ سيدُ الأخلاقِ، ومَن مزَح استُخِفَّ به )) .[41] واتە: بێدەنگ بوون گەورەترین رەوشت بەرزیە ، بەڵام هەر كەسێك گاڵتە بكات ، ئەوا بە سووكی سەیر دەكرێت ، یان بە سووكی لێ وەردەگیرێت ..؟!

[37]-سنن الترمذي برقم (٢٥٠٠).
[38]-سنن الترمذي برقم (٢٥٠١).
[39]-ضعيف الجامع الشيخ الالباني برقم (٣٥٥٤).
[40]-المراسيل لأبي داود برقم (٤٤٦).
[41]-السيوطي في الجامع الصغير برقم (٥١٤٢).

سىَ يەم : بزانە درۆ كردن تاوانێكی زۆر ترسناك و گەورەیە و سزاكەشی سەختە و وازهێنان لێی دەباتە بە هەشتەوە ، هەر وەك ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەلەپێش دا باسمان كرد.

لە (عبدالله بن مسعود ) ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدى إلى البر ، وإن البر يهدى إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وعن الكذب يهدى إلى الفجور ، وإن الفجور يهدى إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[42] واتە: لە (عبدالله كوری مسعود ) – خوا لىَ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : ( پێویست لە سەرتان راستگۆ بن بە راستی راستگۆیی مرۆڤ رێنمویی دەكات بۆ چاكە ، چاكەش رێنمویی دەكات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە راست دەكات و بەدوایی راستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە راستگۆ تۆمار دەكریَ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەراستی دۆر مرۆڤ بەرەوە كاری خراپ دەبات ، كاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەكات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت.؟!

لە ( معاوية بن حيدة القشيري ) – خوا لىَ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : ((ويلٌ لِلَّذِى يُحَدِّثُ بالحدِيثِ لِيُضْحِكَ بِهِ القَوْمَ فيَكَذِبُ ويلٌ لَهُ ويلٌ لَهُ )).[43] واتە: هاوارو واوەیلا بۆ كەسىَ قسەیەك بگێرێتەوە و درۆ بكات بۆ ئەوەی خەلك بێنێتە پێكەنینەوە ، هاوار و واوەیلا بۆ ئەو كەسە ، هاوار و واوەیلا بۆ ئەو كەسە ..؟!

لە (انس بن مالك) – خوا لىَ رازی بێت– دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : (( تقبلوا لی بست ، أتقبل لكم بالجنة : إذا حدث أحدكم فلا يكذب ، وإذا وعد فلا يخلف ، إذا ائتمن فلا يخن ، وغضوا أبصاركم ، وكفوا أيديكم ، واحفظوا فروجكم )) .[44] واتە: ئێوە شەش شتم لێوەربگرن و منیش بەهەشتان بۆ وەر دەگرم : ئەگەر یەكێك لە ئێوە قسەی كرد ئەوا با درۆ نەكات ، وە ئەگەر پەیمانی دا ئەوا با پێچەوانەی نەكات، وە ئەگەر ئەمانەتێك خرایە لای ئەوا با خیانەتی لىَ نەكات ، وە چاوتان دابەخەن و دەستتان بگرنەوە و عەورەت و دامێنتان بپارێزن ..؟!

---

[42]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).
[43]-سنن الترمذي برقم (٢٣١٥
[44]-ذخيرة الحافظ ، ابن القيسراني (١١٦٤/٢).

چوارەم : هاورێیەتی ئەو کەسانە بکە ، کە ئەهلی مەزگەوت قورئان خوێنن ، بەردەوام زمانیان بە زیکرو یادی خوایە ، لە مەجلیسەکانیان و دانیشتنەکانیا بەردەوام قسەی راست و پەندو ئامۆژگاریان لایە ، هەمیشە لە ئەهلی چاك و خێرن ، بەهیچ شێ درۆیان لێ نابیستی و ، وە لێت رازی نابن درۆ قەسەی هەلەق و پەلەقیان بۆ بکەی ، چونکە ئەوانە ئەولیایی (خوای گەورە)ن تەنها لە پێناوی (خوای گەورە ) هەر شتێك یان هەر چاکەیەك هەیە ئەنجامی دەدەن ، هیچ لە کردەوەکانیان ریایی و رووپەمەیی تێدا نیە ، بەلکو قسەی راست حەق بێژەن ، بۆیە هاورێیەتی کردنی ئەوانە ، سوودێکی یەکجار زۆری هەیە ، بۆ دونیاو بۆ دوا رۆژ ، هەر وەك ئەم فەرموودەیە.

لە (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إنَّما مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ، والْجَلِيسِ السَّوْءِ، كَحامِلِ المِسْكِ، ونافِخِ الكِيرِ ، فَحامِلُ المِسْكِ: إمَّا أنْ يُحْذِيَكَ، وإمَّا أنْ تَبْتاعَ منه، وإمَّا أنْ تَجِدَ منه رِيحًا طَيِّبَةً، ونافِخُ الكِيرِ: إمَّا أنْ يُحْرِقَ ثِيابَكَ، وإمَّا أنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً )) .[45] واتە: نموونەی هاورێیەتی چاك و هاورێیەتی خراپ : وەکو هەلگری بۆنی مسك واتە : (بۆن فرۆش ) وە فۆکار بە کوورە واتە : (ئاسنگەر ) وایە ، جا هەلگی بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێ دەبەخشێت یان لێی دەکریت یان بۆنی خۆشی لێ دەبینیت و هەلیدەمژیت ، بەلام فۆکار بە کوورە دا یان جلەکانت دەستوتێنێت یان بۆنی پیسی لێ دەبینیت و هەلێدەمژیت ..؟!

پێنچەم : دوور کەوتنەوە لەو شوێنەی کە خراپەکاری تێدا دەکرێت ، یان ئەو مەجلسەی قەسە پووچی درۆ و تاوانی تێدا دەکرێت ، واتە:جێهیشت بە نیازی چاکە ئەوا خوا تەوبەت قبول دەکات.

لە (ابو سعيد الخدرى ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((كانَ فِيمَن كانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْسًا، فَسَأَلَ عن أعْلَمِ أهْلِ الأرْضِ فَدُلَّ علَى راهِبٍ، فأتاهُ فقالَ: إنَّه قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْسًا، فَهلْ له مِن تَوْبَةٍ؟ فقالَ: لا، فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ به مِئَةً، ثُمَّ سَأَلَ عن أعْلَمِ أهْلِ الأرْضِ فَدُلَّ علَى رَجُلٍ عالِمٍ، فقالَ: إنَّه قَتَلَ مِئَةَ نَفْسٍ، فَهلْ له مِن تَوْبَةٍ؟ فقالَ: نَعَمْ، ومَن يَحُولُ بيْنَهُ وبيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إلى أرْضِ كَذا وكَذا، فإنَّ بها أُناسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ فاعْبُدِ اللَّهَ معهُمْ، ولا تَرْجِعْ إلى أرْضِكَ،

[45]-صحيح مسلم برقم (٢٦٢٨).

فإنَّها أرْضُ سَوْءٍ، فانْطَلَقَ حتَّى إذا نَصَفَ الطَّرِيقَ أتاهُ المَوْتُ، فاخْتَصَمَتْ فيه مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ ومَلائِكَةُ العَذابِ، فقالَتْ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ: جاءَ تائِبًا مُقْبِلاً بقَلْبِهِ إلى اللهِ، وقالَتْ مَلائِكَةُ العَذابِ: إنَّه لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ، فأتاهُمْ مَلَكٌ فى صُورَةِ آدَمِيٍّ، فَجَعَلُوهُ بيْنَهُمْ، فقالَ: قِيسُوا ما بيْنَ الأرْضَيْنِ، فَإِلَى أيَّتِهِما كانَ أدْنَى فَهو له، فَقاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أدْنَى إلى الأرْضِ الَّتى أرادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ. قالَ قَتادَةُ: فقالَ الحَسَنُ ذُكِرَ لَنا، أنَّه لَمَّا أتاهُ المَوْتُ نَأَى بصَدْرِهِ)) .[٤٦] واتە: پیاوێك لەوانەی لە پێش ئێوە وە بوون (٩٩)کەس دەکوژێت پرسیار دەکات دەربارەی زاناترین کەس لە سەر زەوی ..؟! ناونیشانی پیاوێکی (راهب) بۆ هەلدەدەن ، ئەویش دێت بۆ لای و دەلێت : (٩٩) کەسم کوشتووە ، ئایان توبەم بۆ هەیە ..؟!ئەویش دەلێت نەخێر . ئیتر ئەویش دەکوژێت ..!!(١٠٠) پیاو تەواو دەکات ، پاشان پرسیار دەکاتەوە لە زاناترین خەلکی سەر زەوی ، ناونیشانی پیاوێکی بۆ هەلدەدەن ، دەلیّ : ئەوە (١٠٠) پیاوم کوشتووە ئایا توبەم بۆ هەیە ..؟! ئەویش دەلێت : بەلیّ . کیّ هەیە ببێتە کۆسب لە نێوان ئەو تەوبەدا ..؟! بەلام بچۆ بۆ خاکی یان زەوی ئەویّ و ئەویّ ، لەوێدا کەسانێك هەن خەریکی پەرستنی خوای بالادەستن ، تۆش برۆ خوای بالادەست بپەرستە لەگەلیان ، مەگەرێرەوە بۆ خاکی خۆت یان زەوی خۆت ، چونکە خاکێکی یان زەویەکی خراپە ..!! ئەویش دەروات تاکو نیوەی رێگا دەبرێت ، مردن دەگاتە سەر رووحی یان مردن دەمێنگیری دەبێت ، فریشتەی رەحمەت و فریشتە سزا دەبێتە دەمەقالیان و دەمەتەقێیان لە سەری فریشتەی رەحمەت دەلێت : پیاوەکە تەوبەی کردووە بە دل رووی لە خوا کردووە ..؟! فریشتەی سزاش دەلێت : ئەو پیاوە هەر گیز چاکەی نەکردووە ..؟!فریشتەیەك لە شێوەی مرۆڤ دێت بۆ لایان ، دەیکەنە بە ناوبژیوان لە نێوان خۆیاندا ، ئەویش دەلێت : لە نێوان ئەو دوو خاکە یان زەویە کە پێوانە بکەن ، بەلای کەمیاندا نزیکتر بووە ئەوە بۆ ئەوەیانە ، ئیتر خاکە یان زەویەکەیان پێوە کاتیّ سەیر دەکەن ، بەلای ئەو شوێنەیە یان ئەو خاکە یان ئەو زەویە نزیکترە کە ویستویەتی بۆی بچێت ، پاشان فریشتەی رەحمەت رووحی دەکێشێت ..!! قتادە دەلێت : (حسن ) ووتوویەتی : وامان بۆ باسکراوە کاتیّ مردن یەخەی دەگرێت سنگی دەباتە پێش..؟!

---

[٤٦]-صحيح مسلم برقم (٢٧٦٦).

شەشەم : **ئەگەر ویست درۆ بکەیت ئەوا لە شوێنێك یان لە خاكێك یان لە زەویەك بێکە کەوا مولکی (خوای** گەورە ) نەبێت ..؟! پرسیار ئایا دەتوانێت ..؟! ئایا شوێنێك هەیە کە مولکی (خوای گەورە ) نەبێت ..؟! یان ئایە دەتوانێت درۆ بکەی لە جێگایەك یان لە پارچە زەویەك کە (خوای گەورە ) نەیبیسێت ..؟! ئایا دەتوانێت ..؟! کەواتە : ئەی مرۆڤ شەرم لە (خوای گەورە) بکە و درۆ مەکە ، هەرگیز لە ژیانتا ، ئەو کاتە لە پێناوی (خوای گەورە ) راستیت ووتوە ، کە بەدرکاندی ئەم راستیە لە سێدارە بدرێت ..؟! ئەم کاتەش لە پێناوی (خوای گەورە ) وازت لە درۆ هێناوە، کاتیَ بە ووتنی ئەم درۆیە پۆست و پلەو مال و سامانی زۆر بەدەست دەهێنی ، بەلام تۆ لە پێناوی (خوای گەورە ) ئەم درۆیە ناکەیت ، واز لەم هەموو پلەو پۆست و مال و سامانەدەهێنی ..؟!

حەوتەم :بۆ ئەوەی رزگار بێن لە ووتن و قسەی درۆ خۆ دزینەوە لە راستیەکان ، دەبێت بەردەوام داوا لە (خوای گەورە) بکەین و لێی بپارێنەوە و بەلێن : ( خوایە پەنات پیَ دەگرم لە درۆ کردن و یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی بە یەکجاری واز بێنم لە درۆ کردن بە هەموو شێوەیەك ..؟!

## درۆ کردن بۆ گالتە و خۆشی و خۆ هەلکێشان

جێگایی داخە سەرەرای ئەوەی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ﷺ هەموو موسلمانانی ئاگاردار کردووەتەوە لە ترسناکی و خراپەکاری و قێزەونی درۆ کردن ، ئەو نەهامەت و ئاکامەی دووچاری درۆزن دەبێت لە دونیاو لە رۆژی دواییدا ، کەچی بە شێك لە موسلمانان بە شوێنکەوتی پێ بە پێی جوولەکەو گاور دوو رووەکان مولحیدەکان ، ئەوانەی لە سەر رێبازی عەلمانیەتن ، یان ئەوانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن ، هەندێك لە موسلمانان شوێن پێی ئەوانیان هەلگرتووە لە درۆ کردن ، ئەوانە بە حیساب بە درۆ کردن دلی خەلکی خۆش دەکەن ئینجا درۆ کانیان دەگێرنەوە بۆ گالتە خۆشی وەرگرتن ، یان بۆ خۆهەلکێشان لە ناو خەلکی دا درۆدەکەن ..؟! ئەمەش مەترسی دارترین کارو کردەوەیە کە لاسایی بێ باوەران و جوولەکە گاور مولحیدەکان بکەیتەوە ، ئەو کاتە درۆ کردن دەبێتە ناشرین ترین و قێزەون ترین سیفەت لە ئیسلامدا ، کەچی بەشێك لە موسلمانان بە شوێن کەوتنی بێ باوەران خۆشحالی خۆیان دەر دەبرن بەهاتنی درۆ (١) نیسان ، یان چەندی درۆی تر وەکو لەدایك بوونی (عیسی کوری مەریم ) یان درۆ ڤالاتاین ، یان درۆ بەناو یەکسانی ژن پیاو ، یان درۆیی ماف مرۆڤ ، ئیتر چەندین درۆی تر خە لکی رۆژئاوایەکان دایان رشتووە بۆ خۆل کردنە چاوی خەلك ، هەلبەت لە ولاتی خۆمانیش ئەم جۆرە درۆیانە هەن بۆ بەژەوەندی تایبەتی بەکاری دەهێنن ، ئەوانە وادەزانن ئەم جۆرە درۆیانە رێگە پێدراوە لەم رۆژگارەدا ، یان پێیان وایە ئاساییە شەریعەتی ئایینی ئیسلام رێگەی پێداوە ..؟! بۆیە درۆ کردن لە هیچ زمان و سەردەمێك دا رێگە پێدراو نیە ، چونکە موسلمان هیچ کاتێك پەنا ناباتە بەر درۆ کردن ئەگەر بۆ گالتە خۆشش بێت ، چونکە ئەوی کە لە پێشدا باسمان کرد درۆ کردن چەندین سزایی بۆ دانراوە ، هەروەها چەندین زەرەرو زیانی بە کەسی درۆزن دەگەیەنێ ، ئەو حەقیقەتی سزای درۆ کردنە بە چاوی خۆت خوێندتەوە ، هیچی تر نالێم چونکە چی بلێم هەر گیز بە قەد ئەو بەلگانەی سەرەوە بە هێز نین ..! ! ئەگەر یەکێکیش لە دوای ئەو هەموو بەلگەی قورئان و فەرموودە نەگاتە بە دەرئەنجام ئەوا بەدلنیایەوە خۆی خۆش ..؟! چونکە ئەگەر کەسێك دلی نەخۆش بێت چارەسەری ئەستەمە ، یان چونکە زیندووی دل مردووە ئاگایی لە خۆ نیە ..؟! هەمیشە سەرخۆش بێ ئاگایە ، ئێمەش بە سەرەخۆشی مردنی دلی ئاراستە دەکەین ، پێ دەلێن : دل مردوو (إنا لله وإنا إليه راجعون ) چونکە تۆ بەلاشە زیندوو بەلام بە دل مردوویی ..؟!

## درۆ کردن روخسار رەش دەکات

بەڵێ درۆ کردن ئەوەند رەفتارێکی ناشرینە و بەدەرەوشتە روخساری مرۆڤ رەش دەکات ،چونکە ئەوەند ترسناك و ناشرین و بەدە ، جگە لەوەی کاریگەری خراپی هەیە لە سەر تەواو جومگەکانی ژیانی مرۆڤ ، هەروەها کاریگەری هەیە لە سەر روخساری مرۆڤیش ، هەر وەك ئەم فەرموودەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( الكذب سود الوجه ) .[47] واتە: درۆ کردن روخسار رەش دەکات ..؟!

لە (ابو برزة الاسلمي نضلة بن عبيد ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – ((الكذبُ يُسوِّدُ الوجهَ والنَّميمةُ عذابُ القبرِ )) .[48] واتە: درۆ کردن روخسار رەش دەکات ، نەمیمی قسە هێنان و بردنیش دەبێتە سزایی ناو گۆر ..؟!

بێ گومان درۆ کردن زۆر مەترسیدارە ، چونکە هەر کەسێك درۆ بکات بەردەوام روخساری نارێك دەبێت ، لە کاتی قسەکردن روخساری رەش هەڵدەگری یان سور دەبێت ، بەردەوام لە قەڵەقی دڵە راوکێیە لە کاتی قسە کردندا ، هەر بۆیە بەردەوام ترس لە دەربرنی قسەکانی دایە بە دوو دڵی قسە دەکات ، بەردەوام چاو بەو لاو بەو لا دا دەگێرێت ،بۆیە بەخۆی گومان لە قسەکانی خۆی دەکات ، ئەگەر سەرنج بدەیت ئەوانە لە رابردوودا درۆزن بوونە ، لە داهاتووشدا کەس باوەری پێناکات ، چونکە تەواوی راستیەکانی دەکەوێتە ژێر گومانەوە ، تەنانەت خشی گومان لە قسەکانی دەکات ، بۆیە لە کوردەواریش دەڵێن : درۆزن رووی رەشە ، هەمیشە جێگایی متمانەی خەڵکی نیە ، چونکە لە رابردوو دا متمانەی خۆی لە دەستداوە ، ئیتر رووی رەش بووە.
لە (الحسن بن علي بن ابي طالب ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((دَعْ ما يَريبُك إلى ما لا يَريبُك، فإنَّ الصدقَ طمأنينةٌ وإنَّ الكذبَ رِيبةٌ )).[49] واتە : واز لەوە بهێنە کە دەتخاتە گومانەوە ، بۆ شتێك کە ناتخاتە گومانەوە ، چونکە بێگومان راستگۆیی دڵنیاییە ، درۆ کردن و دەڵەسەش دوو دڵییە ..؟!

---

[47]-الطبراني في مجمع الزوائد (٩١/٨)، ابن حبان برقم (٥٧٣٥).
[48]-البيهقي في شعب الايمان (١٧٣٦/٤).
[49]-سنن الترمذي برقم (٢٥١٨)

# درۆ لەگەل نەفسی خۆت مەکە

بەلێ ناپووت و قێزەون ترین درۆ ئەوەی کە درۆ لەگەلە خۆتدا بکەی ، چونکە لە سەرووی هەموویانەوە نابێت درۆ لەگەل خۆتدا بکەیت ، هەر بۆیە ئەو کەسەی یان ئەو پیاوەی درۆ لەگەل خۆی دەکات و گوێ لە درۆی خۆی دەگرێت ، دەگاتە ئاستێك کە ناتوانێت حەقیقەتەکانی ناو خۆی ، یان دەوروبەری جیا بکاتەوە و بەم شێوەیە هەموو رێزێك بۆ خۆی و بۆ کەسانی دیکە لەدەست دەدات ، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە هیچ رێزێك بۆ خۆی دانانی و بۆ دەوروبەرکەشی ، ئینجا وازدەهێنی لەراستیەکان ، چونکە لە بنچینەدا خۆی بە سووك زانیوە ، گوێ بە دوروبەرەکەشی نادا کە راستیان بۆ روون بکاتەوە ، ئینجا لە واز لە راستی دەهێنێت بەردەوام درۆ دەکات ، هەر بۆیە ئەو کەسەی درۆ لە گەل خۆی دەکات ئەستەم واز لە درۆ کردن بهێنێ ، چونکە توانای  ئەوەی نیە کە راستی بدرکێنێ ، چونکە لە راستیدا درۆی لە گەل نەفسی خۆی کردووە ، ئەوەشی درۆ لەگەل نەفسی خۆی بکات  دۆراوە،  هیچ شتێك لەم دونیایەدا بەقەد ووتەی  راست قورستر نیە ..؟! هەر بۆیە ئەو کەسەی درۆ لە گەل خۆیدا دەکات بێ گومان قورسە بەلایەوە کە متمانە بە دەوروبەرەکەی بکات ، چونکە بە خۆی متمانەی بەخۆ نیە ، بۆیە هەمیشە ئەو کەسەی درۆ لە گەل خۆیدا دەکات ، بۆ هەموو شتێك پاساو بۆ درۆکانی دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی خۆی لێ دەرباز بکات ، کەچی نازانێت بە دەستی خۆی دووجاری ئەم کێشەیە بوویتەوە ، بێ ئەوەی هەست هۆشی ئەوەی هەبێت کە درۆ کردووە لە گەل نەفسی خۆی، بەردەوام خۆی تووشی رووبەروو بوونەوە کێشە و نەهامەتی دەکات ، ئیتر ئەو کەسی درۆ کردووە لەگەلە خۆی دەرفتی زۆر گرینگ لە دەست دەدات ، هەست بەوە دەکات کە هیچ کەسێك راستگۆنیە ، هەموو کەسێکی پێ درۆزنە ، بەردەوام لە گومان و دلە راوکێ دایە ، ژیانی لە لای تەنگ و ناخۆش دەبێت ، دۆرەخێك بۆ خۆی لەم ژیانە دروست دەکات ، نەئومێد و هیوای دەمێنی بەردەوام رەش بینە بۆ هەموو شتێك ، خەیالی  پرو پووچ بەتال هەموو مێشکی داگیر کردووە ، زۆر چاك دەزانی کە درۆ کردن حەرامە ، کەچی درۆ لە گەل خۆیدا دەکات ، باوەری لاواز واز لە پەرستنی (خوای گەورە) دەهێنێ بەدوای خەیال و ئارەزووکانی دونیادا دەگەرێ ، کەچی دەزانێ نوێژ واجبە درۆ لەگەل خۆی دەکات ، نوێژ ناکات ، درۆ لەگەل خۆی دەکات ، باوەری بە نیعمەتەکانی خۆی نیە ، کە (خوای گەورە ) چەندین نیعمەتی پێ بەخشیوە ، باوەری بەوەنیە رەحمەت و سۆزو بەزەیی (خوای گەورە ) دەگرێتەوە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت ..؟!

## بۆچی کەسی درۆزن درۆ دەکات ..؟

بەڵێ چەندین هۆکاری جیاواز هەیە بۆ درۆکردن ، هەندێکیان شایەنی لێ خۆش بوونە ، هەندێکیش شایەنی لێ خۆش بوونی نیە ، ئەوەی کە بۆچی کەسی درۆزن درۆ دەکات چەندین هۆکارە بۆ درۆ کردن ئەمانەی خوارەوەن بریتین لە :

١–پاراستنی هەستەکانی کەسێکی تر یان شاردنەوەی هەستەکانی .

٢–درۆکردن بەهۆی هەستەکانی وەك توورەیی دەبرین ، وە ئیرەیی حەسوودی ، نارەحەتی لە شتێکدا ، یان فشاری دەروونی و دڵەراوکی رارایی بێ متمانەی دروست دەبێت .

٣–بۆ مانەوە لە شوێنی خۆت جا چ کار کردن بێت یان ماڵ و جێگا بێت ، یان پلەو پۆست دەسەڵات بێت ، چونکە کاتێك شوێنەکەت کەوتە لەرزین ، ئارامی نەما لەو شوێنە بۆ خۆ بەدوو گرتن لە گەری مەترسیەکان ، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی یەکانت لە دەست نەدەی ، یان بەژەوەندی تاکە کەسی بەدەست بهێنیت ، تەنانە ئەگەر لە سەر حیسابی دۆرانی کەسێکی تریش بێت ، ئەوا دەست دەکات بەدرۆ کردن بۆ مانەوەی لە بەر بەرژەوەندیەکان دەست دەکات بە درۆ کردن .

٤–خۆ بەگەورە زانین لە کەسانی دەوروبەر ، یان بە باشترین خۆ سەیر کردن ، ئەمەش ئەوەیە دەست دەکات بە درۆ کردن بە خۆ دا هەڵدان ، خۆ هەڵکێشان لەسەر کەسانی تر دا .

٥–بۆ کۆنترۆڵ کردن وەرگرتنی دەسەهەڵاتی رەها بە سەر کەسانی تردا .

٦–خۆ ویستی رەچاوی هیچ کەسێك ناکات تەنها بیر لە بەرژەوەندیەکانی خۆی دەکات ، ئینجا مافی دەوربەرەکەی نادات پێشەلی دەکات ، بۆ ئەوەی خۆی لە ژیانێکی شاهانەدا بژیت .

٧–شاردنەوەی راستیەکان ، بڵاو کردنەوەی دۆر لە ناو خەڵکدا .

٨–شاردنەوەی هەڵ و دزیەکانی کەئەنجامی داوە ،بۆ رێگری کردنی لە سزا .

٩–شاردرنەوەی هەستی راستەقینە دەربارەی رووداوەکان بۆ پەرژەوەندی خۆی .

## بۆچی پێویستە درۆ نەکەین ؟

بەپێی ئەوەی کە بۆی دەچم ، وا زنایانیش هەمان بۆ چوونیان هەیە لەسەر ، بێ گومان کەسی درۆزن یان درۆزنەکان کەمتر دلخۆشن ، بۆیە هەمیشە لە گومانەوە دەژین ، بەردەوام دوو دل و دراوکێ لە هەموو ئیش و کارو کردەوەیەك ، هەر چەندە ژیان و تەکنەلۆجیا پێش کەوتووبێت ئەوا درۆزن زۆرترو زیاتر دەبێت ، ژیانیش بەرەو ناخۆشی و قورستر دەچێت ، جگە لەو کار ئاسانەی کە ئەمرۆ تەکنەلۆجیا هێناویەتی،چونکە لە جیاتی بە باشی و بەچاکی وەبەکارو کردەوەی چاك بەکاری بهێنین،بەپێچەوانەکەی بەکاری دەهێنن،بۆنموونەلە تۆرەکۆمەلایەتیەکاندا ، کەسێك شتێك بلاودەکاتەوە بە درۆ ، بەهەزارن کەس بلاوی دەکاتەوە بێ ئەوەی شتێك لەم رووداوە بزانێت ، کەواتە درۆ زۆر بوو بەهۆی ئەو بەکارهێنانەی تەکنەلۆجیا ، هەروەها کەسێك بوختان قسەیەك بەدەمی کەسێکدا هەلدەبەستی ئیتر چەندی کەسی تر ئەم بوختانە بلاودەکەنەوە، هەر بۆیە چەندین هۆکار هەن کە درۆ نەکەین لە گەل خۆ و کەسانی تریش :

١-ووتنی راستی ئاسانترە ، کاتێك درۆیەك دەکەیت پێویستە درۆکانت لەبیر بێت بۆ ئەوەی دواتر درۆ کانت ئاشکرا نەبن ، بەلام راستیەکە لە مێشکتدا دەمێنێتەوە بەبی هیچ هەولێك .

٢-کاتێك درۆ دەکەیت ، پێویستە رێگاکەت بە درۆکانی داهاتوو دا پۆشێت و شتەکان خراپتر نە کەیت .

٣-کاتێك شتەکان ئاشکرا دەبن ، هەموو شتێك وێران و خابوور دەبن ، چونکە بلاو کردنەوەی درۆ زیان بە خۆت کەسە نزیکەکان و هاورێ خۆشەویستەکانت دەگەیەنێ ، بۆیە ئەو متمانەی لە دەست دەدای کە لە پەیوەندیەکانت دا هەیە ، بۆیە پێویست هەولبدیت بۆ قەرەبووکردنەوە ئەم درۆیانەی کردووتە چونکە ئەم دل شکانە هەندێك جار یەکجاریەو قەربوو کردنەوەی بۆ نیە برینەکان سارێژ نابنەوە .

٤-لەوانەیە راستیەکان ئەوەندە ترسناك نەبێت ئاشکرایان بکەیت ، تۆ ئەوەندە بیری لێ دەکەیتەوە ، ئەگەر لە ترسی راستی درۆ دەکەیت جارێك راستگۆبە ، لەوانەیە ئەو کەسانەی کەراستی دەترکێنن تەنها کاردانەوەی نەرێنیان نەبێت ، بەلکو سوپاسی راستگرییەکەت بکەن .

## درۆی مەصلەحەت

بەلیّ موسلمانی راستەقینە هەمیشە راستگۆیە هەر گیز درۆ ناكات ، بە لكو هەر تاوانێك نابێت درۆ بكات بە تایبەتی ئەگەر دۆر كردن لە بەر خاتری خۆی بێت ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ١١٩﴾ [التَّوْبَة : ١١٩] واتە : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بكەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟!

بەلیّ بیّ گومان ئەگەر درۆ كردنە كە بۆ ئەصلاح و چاكە بێت ، واتە لەبەر ژەوەندی گشتی دابێت لە نێوان دوو كەس دا بوو بۆئەوەی پەیوەندیەكەیان توندو بەكەیت ، یان بۆ ئاشت كردنەوە دوو كە س بێت بەلام لە پێناوی خوا بێت ، هیچ بەرژەوەندی تۆی تێدا نەبێت بۆ ئەوەی ئاشتەوای بكەیت ، ئەوا رێگە پێدراوە هیچی تێدانیە (والله أعلم ) هەر وەك ئەم فەرموودانەی خوارەوە ..؟!

لە ( أم كلثوم بنت عقبة ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت : ((ليسَ الكَذَّابُ الّذى يُصلِحُ بينَ النَّاسِ فيُنْمى خيرًا، أو يقولُ خيرًا. وقالَتْ: لم أسمَعْهُ يُرخِّصُ فى شىءٍ ممَّا يقولُ النَّاسُ إلاَّ فى ثلاثٍ: فى الحرْبِ، والإصلاحِ بينَ النَّاسِ، وحديثِ الرجُلِ امرأتَهُ، وحديثِ المرأةِ زوجَها. وكانَتْ أمُّ كُلثومٍ بنتُ عُقبةَ من المهاجِراتِ اللاَّتى بايَعْنَ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم )) .[٥٠] واتە: هەر گیز نەم دیوە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆلەتی درۆكردنی دابێت لە سیّ دۆخدا نەبێت ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : ئەو پیاوە بە درۆزن لە قەلەم نادرێت كە ئەصلاح یان چاكسازی یان ئاشتەوایی بكات لە نێوان خەلكدا قسەیەك بكات تەنها مەبەستی خێر و چاكە و ئاشتەوایی بێت ، لە جەنگدا ، وەك ئەوەی بلیّ لەشكری موسلمانان ژمارەیان زۆر زرۆرە ، یان ژن و پیاو بۆ رازی كردنی یەكتری ، (بۆ ئەوەی دوو بەركی فیتنە ئاژاوە روونەدات لە نێوانیان ).

---

٥٠-سنن ابو داود ٤٩٢١ ، صحيح البخاري برقم (٢٦٩٢) ، صحيح مسلم برقم (٢٦٠٥).

له ( أم كلثوم بنت عقبة ) – خوا لىَ رازى بێت – دەگێرنەوە دەلێت :له پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((لم يكذبْ من نمى بين اثنين ليُصلِحَ وفى لفظٍ: ليس بالكاذبِ من أصلحَ بين الناسِ فقال خيرًا أو نمَّى خيرًا )). [٥١] واتە: ئەو كەسە درۆزن نيە لە نێوان دوو كەسدا قسە دەهێنىَ و قسە دەبات بۆ ئەوەى رێكيان بخاتەوە يان ئاشتيان بكاتەوە ، دەلێن: ئەو كەسە درۆزن نيە لە نێوان خەلكدا قسەى خێر دەكات يان قسە دەهێنىَ و دەيبات بۆ ئەوەى رێكيات بخاتەوە و ئاشتيان بكاتەوە ..؟!

له (بو الدر داء ) – خوا لىَ رازى بێت – دەگێرێتەوە له پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((ألا أخبرُكم بأفضلَ من درجةِ الصيامِ والصلاةِ والصدقةِ ؟ قالوا: بلى، قال: إصلاحُ ذاتِ البينِ ، وفسادُ ذاتِ البينِ الحالِقةُ )) . [٥٢] واتە: هەوالتان بدەمىَ بە چاكتر له پلەو پايەى رۆژوو نوێژ و خێر و خێرات ..؟! ووتيان : بەلىَ . فەرمووى : چاكسازى يان ئاشتەوايى نێوان خەلك ، واتە : ئاشتكردنەوەى ئەو كەسانەى قسە لەگەل يەك ناكەن ، و ناكۆكن و نێوانيان تێك چووە ، وە تێكدانى نێوان خەلك تاشەرى ئايينە واتە وەك چۆن مووس يان گوێزان موو دەتاشىَ ئەويش ئاوا ئايين دەتاشىَ ..؟!

بەلىَ هەر كەسێك مەبەستى چاكە و ئاشتەوايى و خێرو خێرات بێت لە نێوان خەلكدا و بلێت فلانكەس بە باشى باسى تۆى كردووە و يان فلان كەس دوعايى خێرت بۆ دەكات ، يان فلان كەس تۆى زۆر خۆش دەوێت ، كەچى ئەمانە درۆش بێت ، ئەوا درۆ كردن بۆ مەبەستى چاكە خێرە ، حەرام نيە ، بۆيە ئەگەر تەنها بۆ ئەم مەبەستە بێت ئەوا درۆكردنەكە دروستە هيچى تێدانيە ، هەر بۆيە ئەم درۆيە پىَ دەوترێت درۆيى مەصلەحەت وەك لە فەرموودەكەدا باسكراوە، تێبينى / درۆ كردن بۆ مەصلەحەتى تايبەتى دروست نيە و حەرامە ، يان بۆ ئەوەى بگات بە مەبەستى تايبەتى خۆى و درۆى لە نێوان دووكەس دابكات ، بەلىَ ئەم جۆرەيان دروست نيە و حەرامە ، چونكە بەژەوەندى خۆى تێدا بەدى كردووە ، بەلام هەندێك كەس درۆ دەكەن بە نەزانى لەم فەرموودە تێدەگەن ، چەندين درۆ دەكەن دەلێن : درۆيى مەصلەحەت ، ئەوە نابێت و دروست نيە ، جگە لەمانەى كەباسمان كرد درۆ كردن تێدا حەرامە ..؟!

---

[٥١]-سنن ابو داود برقم (٤٩٢٠).
[٥٢]-سنن ابو داود برقم (٤٩١٩).

بەڵێ وەکو باسمان کرد دروستە لە سێ حالەت یان بارو دۆخدا درۆ بکەیت ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمانی روون کردۆتەوە ، هیچی تر تێدا دروست نیە جگە لەم سێ حالەتەدا نەبێت کە لەم فەرموودەیە دا هاتووە :

لە ( أم كلثوم بنت عقبة ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرنەوە دەڵێت : ((ليسَ الكَذَّابُ الّذى يُصلِحُ بينَ النَّاسِ فيُنْمى خيرًا، أو يقولُ خيرًا. وقالَتْ: لم أسمَعْهُ يُرخِّصُ فى شىءٍ ممَّا يقولُ النَّاسُ إلاَّ فى ثلاثٍ: فى الحرْبِ، والإصلاحِ بينَ النَّاسِ، وحديثِ الرجُلِ امرأتَهُ، وحديثِ المرأةِ زوجَها. وكانَتْ أمُّ كُلثومٍ بنتُ عُقبةَ من المهاجِراتِ اللاَّتى بايَعْنَ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم )) . [٥٣]

کەواتە بۆ ئەم سێ حالەتە دروستە ، کاتێك پیاو قسە دەکات بۆ خێزانی بۆ ئەوەی رازی بکات کێشە دروست نەبێت لە نێوانیان دا ، هەروەها لە کاتی جەنگ کردن ، درۆ بکەی کە دوژمن بە رێژەی سوپاکەت نەزانی یان بە پیلانەکانی جەنگ نەزانی ، هەروەها درۆ کردن بۆ ئەصلاح کردن یان ئاشتەوایی نێوان دوو کەس بە مەبەستی چاکسازیی نێوانیان و ئاشت کردنەوەیان ،بەلام سەبارەت بە درۆ کردن بۆ خێزان بۆ ئەوەی رازی بکات مەبەست پێ دیار خستنی خۆشەویستی یە ، بۆ ئەوەی سۆز و رەحم بەردەوام بێت لە نێوانیان لە بەر خاتری منداڵەکان بۆ ئەوەی پەروەردی چاك بکرێن و کێشە دروست نەبێت ، بۆ نموونە پێ دەڵێت : کەسێ لە لای من خۆشتەویست تر نیە لە تۆ ، یان جوانترین ئافرەتی سەر زەوی لە پێش چاوی من ، یان تۆ زۆر بەرێزو گران بەهای لای من ، مەبەستی فەرموودەکە ئەوە نیە کە مافەکانی ئافرەت بخۆی خیانەت ناپاکی لێ بکەیت ، بەڵکو بۆ چاکسازیە خۆشەویستی پەیوەندی توندو تۆڵی خێزانە ..؟!

[٥٣] -سنن ابو داود ٤٩٢١ ، صحيح البخاري برقم (٢٦٩٢) ، صحيح مسلم برقم (٢٦٠٥).

له (ئیمامی النوویی ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : (سەبارەت به درۆکردن بۆ ئافرەت یان ئافرەت بۆ پیاو مەبەست پێی دیار خستنی خۆشەویستی یه ).[٥٤]

له (ابن حجر عسقلانی ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : (هەموو زانایان یەك دەنگن مەبەست به درۆ بۆ ژن و پیاو ئەوەیه کەحەق له سەر ژن یان پیاو لانەچێت ، یان شتێك وەربگرێت هی پیاو یان ئافرەت نییه ، بەلکو ئەمانه حەرامه به یەك دەنگی هەموو زانایان ).[٥٥]

له (ابن عثیمین ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : ( هەروەها له مەصلەحەته قسەی پیاو بۆ خێزانی ، وه قسەی ئافرەت بۆ پیاوی که خۆشەویستی و سۆز دەکەوێته نێوانیان ، وەك ئەوەی پیاو بلێت : تۆ لای من گرانی ، وه تۆ خۆشەویست تری لای من له هەموو ئافرەتەکانی تر ، وه قسەی تری هاوشێوەی ئەمانه ، ئەگەر چی درۆیش بکات، بەلام له پێناو گەیاندنی خۆشەویستی ، مەصلەحەت داوای ئەمه دەکات ) .[٥٦]

بەلیّ بەدلنیایەوە موسلمان دەبێت تەقوایی (خوای گەورە) بکات و سنوور نەبەزێنێت له درۆ کردن ، بۆ خێزانەکەی خۆی ، وه ئافرەتیش به هەمان شێوه سنووری درۆ کردن نەبەزێنێت بۆ پیاوه کەی خۆی ، به جۆرێك ئەم سنوور بەزاندنه بگاته ئەو رادەیه که متمانه نەمێنێت له نێوان ژن پیاو دا ، ئەوەی ریگه پێدارو بێت له نێوانیان تەنها بۆ خۆشەویستی و رەحمه بەزەیی و ، چاکسازیی نێوانی ژن و پیاوه بۆ مەبەستی ئەوەی خێزانەکه هەلنەوەشێتەوە ، مندالەکانیان زۆر به پەروەردەیەکی تەندروست ژینگەیەکی ئارام و ئاسووده دروست بکەن لەمالەکەیان دا ، نەك ئەم درۆ کردنه ببێته هەلەوشانەوه دوو بەرەکی و ناکۆکی نێوانیان به لکو بۆ پەروەردەکردنی خێزانێکی تەندروسته ، وه له پێش دا باسمان کرد تەنها له سیّ حالەت درۆ دروسته یان حەرام نیه ، ئەویش بۆ ئاشتەوایی ، خۆشەویستی خێزان ، و له کاتی جەنگ کردن ..؟!

---

٥٤- شرح مسلم .
٥٥- فتح الباري .
٥٦-شرح رياض الصالحين (١/١٧٩٠).

## سزایی درۆ و بوختان هەلبەستن

بەلێ بوختان یان درۆ هەلبەستن ، ئەوەیە کە سەرنجی کەسێك یان گوێگرێك رابکێشی و بە ووتەو قسەو درۆ کانت سەرسامی بکەی ، کەچی درۆ بێت بوختان هەلبەستی بە نەفسی خۆیت یان بە کەسێکی تر ، هەر بۆیە بزانە درۆ کردن یان بوختان هەلبەستن لە تاوانە گەورەکانە ، وە زۆر لە غەیبەت و نەمیمی کردن گەورەترە ، چونکە بەهۆی بوختانەوە رق و قینەی خەلك بەرانبەر ئەم کەسە بەرپا دەکەیت ، کەچی درۆت بۆ هەلبەستێوە و بوختانت پێ کردووە ، هەر وەك لەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتوو کە دەفەرمووێت : (( پێنچ شت کەفارەتی نیە بەهۆی گەورەی تاوانەکە ، شەریك بۆ خوا دانان ، کوشتنی بەناحەق ، وە بوختان هەلبەستن بە ئیمانداران ، وە هەلاتن لە جەنگی لە بەرانبەر کافران ، وە درۆ کردن لە پێناو بەدەست هێنانی مالی خەلك بە نارەوا )).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : (( هەر کەسێك باسی کەسێك بکات بۆ ئەوەی عەیبداری بکات ، (خوای گەورە) لە دۆزەخدا دەیهێلێتەوە و بەندی یان حەپسی دەکات )).

ووتراوە : هەموو تاوانێك درۆیە ، وە لە ناو هەموو درۆکانیش گەورەتر بوختان و درۆ هەلبەستینە ، وە سەری هەموو تاوانێك زمانە گەر توانیت زمانت بگریت لە خراپە ئەوە بزانە نزیك بوویەتەوە لە بەهشتەوە ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦﴾ [النُّور : ١٦]
واتە: وە ئەبوایە بتانوتایە پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە کە کراوە بۆ عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت)..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ٥٨﴾ [الأَحْزَاب : ٥٨] واتە: [ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا ] وە ئەو کەسانەی کە ئازاری باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت ئەدەن بە شتێك کە خۆیان ئەنجامیان نەداوە، واتە: بوهتانیان بۆ ئەکەن [ فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا ] بەڕاستی ئەمە بوهتانیان بۆ کردوون و درۆیان بۆ هەڵبەستوون و تاوانێکی زۆر ئاشکرایان کردووە..؟!

# چەندین هۆکار هەن وادەکات مرۆڤ درۆ بکات

بێ گومان درۆ کردن یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ، کە (خوای گەورە ) حەرامی کردووە ، هەروەها ئەو دیاردە ترسناك و قەدەغەکراوەیە کەسەرجەمی مرۆڤ بەدەستیەوە دەنالێنێ، کە مرۆڤ دەخاتە حالە تی شەرمەزارییەوە ، بەگوێرەی ئەو توێژینەوانەی کراون حەوت هۆکار هەن کە زۆر زەق وادەکەن مرۆڤ درۆ بکات ، زاناو شارەزایان دووپاتی ئەوەش دەکەنەوە هیچ یەکێك لە هۆکارەکان چارەسەر نیە ، بەلکو کێشەی کەسی درۆزن گەورەترو قولتر دەکەنەوە ،ئەمانەی خوارەوەن :

**یەکەم : بەرگری و خۆپاراستن لە نائومێدی :**

بەلێ زۆر جار خەلکانێك یان کەسانێك هەن دەیانەوێت بە درۆ کردن بەرگری لە خۆیان بکەن ، بەم کارو کردەوەیەك دەیانەوێت خۆیان لە ئەنجامی لێ پرسینەوە بە دوور بگرن ، کەچی نازانن بەو درۆ کردنە دەرئەنجامی کارو کردەوە خراپەکەیان زۆر ترسناك ترو خراپتر دەبێت ، یان کەسانێك هەن درۆ دەکەن بۆ ئەوەی بێ ئومێدی لە کەسانی دەوربەریان دوور بخەنەوە ، بەلام نازانن کە درۆیان ئاشکرا دەبێت ئەوا بێ ئومێدی زیاتر دەبێت ..؟!

**دووەم: تۆلە کردنەوە رق و قینە و یاریکردن بە خەلك :**

هەندێك کەس درۆ کردن بۆ تۆلە کردنەوە و رق قینە یاریکردن دەکەن ، بۆ ئەوەی سەرنجی کەسانی تر رابکێشێت ، یان بۆ ئەوەی وا بکات خەلك زیاتر بایەخی پێ بدەن و وابزانن ئەو کەسە لەوان گرنگترە ..؟!

**سێ یەم : داپۆشین و شاردنەوە و راکردن لە راستیەکان :**

هەندێك کەس دەیانەوێت بە داپۆشین و شاردنەوە ، وە راکردن لە راستیەکان ، بە درۆ کردن خۆیان لە سزا و لێ پرسینەوە رزگار بکەن ، وە لە ترسی ئەوەی روو بەرووی سزاو لێ پرسینەوە نەبن رادەکەن لە راستیەکان ، یان درۆ دەکەن بۆ ئەوەی راستیەکان بشارنەوە ، هەر بۆیە مندالان زۆر بەی جار لە ترسی لێ پرسینەوە و سزا پەنا بۆ درۆ کردن دەبات ، بێ گومان کەسی درۆزن زۆر بەجار ترسنۆکە بەرگەی سەرزەنشت کردن و لێ پرسینەوە و سزا ناگرێت ، هەر بۆیە پەنا بۆ درۆ کردن دەبات ..؟!

چوارەم : بۆ خۆشی سەرگەرمی و لاف لێدان و خۆهەلکێشان :

هەندێك کەس هەن درۆ دەکەن لە گەل هاورێ هاوکارو کەسە نزیکەکانیان ، تەنها بۆ خۆشی کات بەسەر بردن سەرگەرمی لاف لێدان و خۆهەلکێشان ،بۆ نموونە درۆیەك دەکات تا بزانێ کاردنەوەی بەرانبەرەکەی چی یە..؟! بەلام کەچی نازانێن ئەم گوفتارو درۆ کردنەی کاردانەوەی خراپی لێ دەکەوێتەوە ، وە ناشزانی کەچەندە گوناهێکی گەورەی کردووە ،یان ئەو هەلسوکەتەی کاردانەوەی خراپی دەبێت ئەگەر ئەو کاتیش نەبێت کە درۆیەکەی کردووە ، بەلام لە داهاتوو دا متمانەی لە دەست دەکات لە ناو هاورێ و هاوکارو کە سە نزیکەکان خۆی ، بە کەسێکی درۆزن ناودەبرێت ، وەدەر ئەنجامی درۆ کردنەکەی دەردەکەوێت و زۆر بە خراپی بۆیی دەگەرێتەوە..؟!

پێنچەم : بۆ پاراستنی پیوەندەی کۆمەلایەتیەکان :

هەندێك لە زانایان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ، ئەم جۆرە هۆکارە هەر لە منداڵییەوە لە لای مرۆڤ دەردەکەوێت ، بۆ نموونە منداڵێك بۆ ئەوەی سەرنجراکێشانی دەوروبەری دەگری یان پێدەکەنێ ، تا دەوربەرەکەی رازی بکات ، هەر بۆیە بەردەوام بوونی لەسەر ئەم درۆ کردنە وا دەکات کە گەورەش بوو ، لە دوایی دا دەبێتە درۆزنێکی زۆر گەورە و ترسناك ، لە وانەش یەکسەر درۆیەکەی ئاشکرا نەبێت ، بەلام پێ بەپێ سەر ئەنجامێکی خراپی دەبێت ، لە درۆ کردنەوە هەنگاوی گەورە دەهاوێت بۆ بێ بەلێنی و درۆ هەلبەستن و بوختان جاسووسی و ناپاکی و دزی کردن ، ئەم سەر ئەنجامە خراپانەی لێ دەکەوێت ، لە کۆتاییشد بەردەوام شوێن و جێگاو حەسانەوی لە بەندیخانە بەسەر دەبات ، چونکە مرۆڤێکی فاشل ناپووت ساقت وهیچ وپووچی لێ دەردەچێت ..؟!

شەشەم : لەبەر چاو گرتنی هەست و سۆزی کەسانی تر :

رەنگە ئەگەر بە خێرایی سەیری ئەو رستەیەی سەرەوە بکەین ، بە هۆکارێکی باشی بزانین ، بەلام ئەگەر لێی ووردبینەوە وانیە ، بۆ نموونە : ئافرەتێك دەیەوێ رەچاوی هەست و سۆزی هاسەرەکەی بکات کاتێك یەکێك تەلەفۆن بۆ هاوسەرەکەی دەکات یەکسەر ئەو وەلامی دەداتەوە و دەلێ لەمالەوە نیە ، تەنیا لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەی یان پیاوەکەی حەزنەکات قسە لە گەل ئەو کەسە بکات ، هەر بۆیە لە بەرخاتری هاوسەرەکەی درۆیی بۆ دەکات ، ئەمەش دیاردەیەکی ناشرینە زۆر خراپە ، ئەویش دەبێتە هۆی ئەوەی لە دەستدانی متمانە لە نێوان ئەم دوو هاسەرە

، چونکە ئافرەتکە دەلێت ئەگەر درۆ لە گەل خەلك بکات جۆن لەگەل منیش ناکات ، ئیتر ئەم جۆرە درۆ کردنە بۆ هەست سۆز کارێکی خراپە و ناپەسەندە ..؟!

حەوتەم : نەبوونی متمانە بە نەفسی خۆی یان کەسێتی خۆی :

بەلیٚ خەلکانێك درۆ دەکەن تەنها بۆ ئەوەی کە حەقیقەت و واقیعی خۆیان بشارنەوە ، بۆ نموونە: پێگەی کۆمەلایەتی یان باری دارایی خۆیان بە درۆ دەشارنەوە ، بۆ نموونە: ئەم کەسانە بەلایانەوە شەرمە کورە هەژار بێت یان کچە هەژار بێت ،یان باوکی کارێك دەکات خۆی بەنزمە سەیر دەکان بەلایەوە شەرمە بلێت کوری فەلان کەسم ، یان کەس و کارەکەی لە ناو خەلك بە خراپی ناویان رۆیشتووە ، ئەو پیٚ شەرمە خۆی بە خزم وکەس کاری ، بناسرێت ، بیٚ گومان بە درۆ حاشا کردن لە باوك و دایك ئەمەش کارێکی خراپە ، یان هیچ کات متمانە بەنەفسی خۆی ناکات ئەگەر رۆژێك راستگۆ بێت،بۆیە هەمیشە درۆ لەگەل خەلك دەکات وهەروەها درۆش لەگەل نەفسی خۆی دەکات.

هەشتەم: بە هۆی بەرژەوندی کەسێیەتی خۆی :

بەلیٚ بەژوەندی لە سەرووی هەموو هۆکارەکانیەوەیە ، رەنگە هەموو ئەو هۆکارانە لە ووشەی (بەرژەوندی ) چربکرێتەوە ، ئەو کەسەی درۆ دەکات بۆ بەرژەوندیەکە بەلام مەرج نیە تەنیا بەرژەوندیەکەمادی بێت ، بۆ نموونە : کەسێك کە بەدرۆ دەیەویٚ پێوەندییەکی سۆزداری یان کۆمەلایەتی رابگرێت ئەوا بەرژەوندی و کۆمەلایەتی و دەروونی خۆی وا دەخوازێت ئەو پەیوەندیە رابگرێت ، یان کەسێك بە درۆ خۆی وا نیشان دەدات کە جێگەی بەزەیی کەسانی دەوروبەری بێت، ئەوا دەیەویٚ بەژوەندی دەست بکەوێت ، یان کەسێك بۆ ئەوەی سەرمەزاری تووشی خۆی نەکات ، بە درۆ خۆی لە کارێك دوور دەخاتەوە ، ئەوا بەژوەندیەکەی خۆی بپارێزی ..؟!

## چی بکەین بۆ ئەوەی بیٚ درۆ کردن بەرژوەندیەکانمان بپاریٚزین ..؟

١–دەبێت بزانین چ شتێك ماف ئێمە یان ماف ئێمە نیە، ئەوی ماف ئێمەیە تا هەولی بۆ بدەین و چاو نەبرینە ماف کەسانی ترتابەدرۆ کردن یان درۆ هەلبەستن و بوخان لە دەستیان دەربهێنین.؟!

٢–بەرژوەندە مادیی و مەعنەویەکان بە راستگۆیی و هەول کۆشش دەبێت ، وە لە سەر بنەمای ماف و حەف رەوا دروست دەبێت ، ئەگەر باوەرمان یان ئیرادەمان بەم دوو راستیە هەبوو ئەوا ئەو کات هیچ ناچار نابین درۆ بکەین ..؟!

٣–هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی و ئەمانەت ، کاتێك دەمانەوێ کارێك بکەین دەبێت بیر بکەینەوە بەر لەوەی بریار بدەین یان ئەنجامی بدەین ، کە کاتێك بریارمان دا دەبێت بەرپرسیاریەتی ئەنجامەکەی لە ئەستۆی خۆمان بگرین ، ئەوەك بیٚ بیر کردنەوە کارەکە بکەین و بە درۆ خۆمان لە ئەنجامەکەی دوور بخەینەوە ..؟!

٤–لەوە بگەین کە خودی مرۆڤ یان نەفسی مرۆڤ گرنگە نەوەك تەنیا مرۆڤ لە روالەت چر بکەینەوە ، ئەگەر ئەو بروایەمان هەبێت ناچار نابین بۆ دەرخستنی پێگەی کۆمەلایەتی و بۆ خۆ هەلکێشان درۆ بکەین ..؟!

٥–دروستکردنی کۆمەلایەتی و سوزداری لەسەر بنەمای دروست و نیاز پاکی نەك درۆ کردن و بەرژوەندییە مادییەکان واتە: کەسایەتی لە سەر راستگۆیی و نیاز پاکی بەر پا دەبێت نەك لە سەر درۆ کردن ..؟!

٦–تابکرێت هەلە نەکەین بۆ ئەوەی پێویستمان بە خۆ دزینەوە نەبێت ، یان هەلەکە بە درۆ کردن چاك نەکەینەوە چونکە زیانەکەی گەورەتر دەبێت ..؟!

٧–رەچاو کردنی ئەو خالانەی کە کەسایەتی یان نەفسی مرۆڤ بەهێز دەکات ، بۆ نموونە : راستگۆیی ئیرادە و باوەری بەهێزو دامەزراوی ئیمان ، روو کردنە بەرەو پەیمامەکەی ئیسلام ئەویش قورئان فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، ئەمەش بەرژوەندی گەورەیی بەدوایی خۆی دادەهێنی لە هەموو رووەکانی ژیانی دونیادا ، هەروەها لە قیامەتیش بەهەشت بەدەست دەهێنی..؟!

## ناسینەوەی ئەو نیشانانەی کەوا دەری دەخات مرۆڤ درۆ دەکات

بێ گومان هەموو کەسێك حەزدەکات کەسانی راستگۆ پاك لە دەوربەری بێت ، بەم هۆیەش ناسینی درۆزنەکان و دوور کەوتنەوە لێیان باشترین شتە کە بتوانین ئەنجامی بدەین ، هەلبەت ناسینی ئەو کەسانەی کە درۆزن و راستیەکان دەشارنەوە درۆ لەگەل خەلکی دەکەن کارێکی هەر وا ئاسان نیە ، هەر وەك ووتراوە: قورسترین گفتارو رفتاری مرۆڤ ئەوەیە کە راستی بترکێنێ دەری بخات ، وە ئاسانترین گوفتارو رفتاری مرۆڤیش ئەوەیە کە درۆ دەکات ، هەر بۆیە بە بەرزکردنەوەی ئاستی ناسینی مرۆڤەکان و تێگەیشتن لە ئەزموونی ژیان ، وە بەیارمەتی کۆمەلێك نیشانە دەتوانێن کەسە درۆزنەکان لە راستگۆکان جیا بکەوینەوە ، ئایا دەزانی ٪٥٤درۆکان دەتوانرێت وەك راستی دەربخرێت و داپۆشرێت ..؟! هەروەها ئەو کەسانەی خۆیان دەردەخەن زیاتر درۆ دەکەن وەك لە کەسە گۆشەگیرەکان ، بەگوێرەی ئەوەی زاناکان شارەزایان لە توێژینەوەکانیاندا ئەنجامیانداوە کە لە ٪٨٢درۆکان شکرا ناکرێن..!! وە لە راپرسیەکان وا دەری دەخەن لە ولاتی ئەمریکا خەلکی ئەمریکا رۆژانە چوار جار درۆ دەکەن ،بەلام هەندێك رێگا هەیە کە خەلك لەو رێگەیەوە دەتوانن شارەزایەکانی جیاکردنەوە راستیەکانیان پێ زیاد بکەن بۆ پاراستنی خۆیان هەم لە رووی پەرژوەندیە مالی و دارایی و هەم دەروونیەکانیان ، هەروەها ئەو درۆیانەی کە زۆر ترینن زیانی دارایی لە ٪٢١ لە رێگایی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان وە کو تەلەفۆن و فیس بووك واتس اب ...هتد ، ئەمانە بۆ هەلخەلەتاندن یان هەرەشەکردن بە کار دەهێنرێت ، یان ئابروو بردن بە درۆ فێل تەلەکە و کاری قێزەونی ، یان تۆرە کۆمەلایەتیەکان بەکار دەهێنن بۆ فێل کردن خەش تەلەکەبازی و هەرەشەکرن لە خەلك بە مەبەستی دەرکردنی زانیاری کەسی یان ئابروو بردن ،یان بردنی پارەو مال دارایەکان ، هەر گیز باوەر بە تەلەفۆن تۆرەکۆمەلایەتیەکان مەکەن لەم رێگەیەوە کەسایەتیەتی خۆت لە دەست مەدە مال و پارەو دارایی خۆت مەدۆرێنە بە درۆ کانی ئەمانە چونکە هەموو وەهم و فروفێل و بەردنی مال خەلك بە نارەوا ، ئەوانە درۆزن پارەکە کۆ دەکەنەوە تەنها لە رێگەی درۆ کردنەوە ئاگاردار بن وریابن..؟!

## نیشانەکانی ناسینەوە کەسی درۆزن وە خۆپاراستن لێیان

### ١–گۆرانکاری لە شێوازەکانی قسە کردن :

کاتێك کەسێك هەولدەدات درۆ بکات و راستیەکان بشارێتەوە بەتایبەتی لە بابەتێکی گرنگدا گۆرانکاری لە دەنگ تۆنی دەنگی شێوازی قسەکردنی دروست دەبێت ، بە وورپایەوە گۆی لە کەسە بگرە کاتێك قسەت بۆ دەکات ، وە بزانە هەلسوکەوت و رووخساری بە چی جۆرێکە تاکو زیاتر دلنیا بیتەوە لە قسەکانی ، هەروەها کاتێك لە بابەتێك گومانت لەسەر کەسەکە هەبوو پرسیاری ئەو شتانەی لێبکە کە دەیزانێت لە سەری بۆ ئەوەی بزانیت کە ئایا راستت پێ دەلێت یان نا ..؟!

### ٢–بەکارهێنانی هێمای نەگونجاو یان هێمای ئاماژە :

بۆ نموونە : واتە کەسێك بلێت : بەلێ . بەلام سەری جوولە پێ بکە یان سەری بە نەخێر بەلەرزێنێت، لەوانەیە نیشانەی ئەوە بێت راستی نەترکێنێ یان راستی نەلێت ، بەلێ زانایان دەلێن : جوولە نەگونجاوەکان جوولەیەکن لە جەستەدا کە لەگەل ووشەکان یان ووتەکانی کە سێکدا ناگونجێن و ئەوە دەردەخەن نیەتی ئەم کەسە و قسەکانی یەك شت نیە ، واتە : لە ووتن دا جیاوازە لە گەل ئەوەی لەناوەوەیە راست نیە ، یان کاتێك کەسێك باسی ئەوە دەکات کە لە بیری دایە و لەپیلانیدایە زمانی جەستەی لە پال هەلسوکەوت و کردارەکانی هەموویان یەکدەگرنەوە لەگەل گوفتارەکانی ، بۆیە بە وریاییەوە سەرنجی هەلسوکەوتەکانی ئەو کەسە بدە کە راستگۆییەکەی بەلاتەوە گرنگە ..؟!

### ٣–قسەنەکردن بە پێی پێویست :

کاتێك پرسیار لە کەسێك دەکەیت دەربارەی بابەتێك دەبینیت زۆر بە کورتی وەلام دەداتەوە ، لەم کاتەدا ئەوگریمانەیە هەیە کە لەوانەیە کەسەکە بابەتێك بشارێتەوە هەروەها نایەوێت درۆی زیاتر بکات یاخود لەوانەیە نەزانێت چۆن بە درۆ وە درێژە بەبابەتەکە بدات لەترسی ئاشکرا بوونی.

بۆنموونە : کاتێك شایەتحالەکان باسی ئەوە دەکەن کە رووداوێکیان بینیونەوە و پرسیاریان لێدەکرێت : ئایا هیچ شتێکی دیکە هەیە ..؟! ووردەکاری زیاتر ئاشکرا دەکەن ، بەلام کاتێك داوا لە درۆزنەکان دەکرێت زیاتر لە چیرۆکەکە یان رووداوەکە ئامادەکراوەکانیان باس بکەن ، ئەوان دەوەستن و هیچ نالێن چونکە نازانن چۆن چیرۆکەکەیان کۆتایی پێبهێنن ..! !زانیان باس لەوەدەکەن دەلێن " درۆزن بە فەرامۆشکردن و هەلخەلەتێنن " کە کاتێك داوایان لیَ دەکرێت وەلامی پرسیارەکتم بدەنەوە یان وردەکاری زیاتر پێشکەش بکەن ، ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی کەمتر لەو کەسانە پێشکەش دەکەن کە راستی دەلێن ، یان راستگۆن ، ئەمە دەتوانرێت لە رێگەی وەرگێرانی پەیوەندی تەلەفۆنیەکانەوە ، یان لە لێدوانەکانی شایەتحالەکان یان لە تێبینی بکرێت بە نەبوونی ووشەی وەسفکراو لە گفتو گۆدا ، هەربۆیە ئێستا درۆ کردن لەم سەردەمە هەر زۆر ئاسان بووە هەموو کەسێکی ئاسایی دەتوانیَ دۆر بکە زۆر بە ئاسانی وەك بەکار هێنانی تەلە فۆن و تۆرەکۆمەلایەتیەکان ، چونکە مجالێکی فەروان بۆ ئەوەی درۆ کانیان تێدا بکەن ، ئەو درۆیە ئاسان تر بە تەلەفۆن یان بە تۆرەکۆمەلایەتیەکان لە درۆیەك کە روو بەروو بکەیت ، بۆیە لەم سەردەمەدرۆ زیاتر بووە ، رۆژانەی خەلکی چ لە کارو پیشەکەی دا چ لە مامەلەو بازرگانی دا زیاتر بووە، رێگایەکی تریش ئەوەیە کە داوا لە خەلك دەکرێت رووداوەکان بلێن :راسگۆکان لە سەر هەمان چیرۆك یان رووداو دەمێنەوە ، لە کاتێك دا ئەوان زیاتر ووردەکاری پێشکەش دەکەن بۆ ئەوەی راستیەکان روونتر بکرێنەوە ، بەلام لە کاتێك دا زۆر جار درۆزنەکان هەلدەقولێن رووداو چیرۆکێکی جیاواتر دروست دەکەن بەبیَ بنەما یان بەبیَ زیاد کردنی ووردەکاری بۆ رووداوەکەی پێشتر ،بەمەش ئەوە دەردەکەوێت کە بابەتەك لەسەرەتاوە راست نیە درۆیەکەهەلبەستراوە..؟!

### ٤- زۆر قسەکردن یان زیادەڕۆیی لەقسەکردندا :

بەلێ زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو درۆیانەی کە هەولی فێل و تەلەکە و هەلخەلەتاندن دەدەن ڕاستیەکە بە زۆر ووشە درێژ دەکەنەوە ، واتە :" یەك ووشەی ڕاستی نزیکەی سەدە درۆی بۆ زیاد دەکەن " لەوانەیە شتی زۆر دروست بکەن ڕووداوی جیاواز بگێرنەوە کاتێك درۆ دەکەن ،لەوانەیە ووردەکاری زیاد بکەن بۆ ئەوەی خۆیان یان بەرانبەرەکانیان ڕازی بکەن بەوە زێدەڕۆییە کە قسەکانیاندا هەیە ، هەروەها ئاماژە زمانەوانیەکان کە ئاشکرا کراون ئەوە نیشان دەدەن کە درۆزنەکان زیاتر قسەی ناشرین پرو پووچ قێزەون دەکەن لە کاتی قسەکردندا ، هەروەها لە کاتی قسەکردنەکانیان دا زیاتر باسی کەسی سێیەم دەکەن ، بۆنموونە: فلان کەس ئاوا بوو یان فلان کەس ئەوەی ووت ، یان گوێم لێ بوو ، چەندین گوفتاری تریش باس دەکەن ، بۆیە بەردەوام باسی کەسی سێیەم دەکەن و کەسی سێیەم زۆر بەکاردەهێنن ، بۆنموونە: فلان وایکرد فیسکە وایکرد ئەوان وایان کرد ، یان وایای ووت ، وە یان وا چوون ...هتد ، تەنها بۆ ئەوەی خۆیان لە بابەتە ڕاستیەکە دوو ربخنەوە ..؟!

### ٥-بەرزبوونەوە و نزمبوونەو لە تۆنی دەنگ لە کاتێ قسەکردن :

بەلێ دەربارەی بەرزبوونەوە نزمبوونەوە لەتۆنی دەنگ دا لەکاتی قسەکردندا ئەمەش نیشانە یەکە لە نیشانەکانی ئەو کەسەی کە ڕاست دەکات یان درۆ دەکات ، ئەوەش زانایان ئاماژەیان پێ کردووە بە پێ داب و نەریت کلتووری ولاتان ، بۆ دۆزینەوە درۆکان ، بۆیە زانایان جەخت لەوە دەکەنەوە دەبێت ڕەچاوی لایەنگری کەلتووری ولاتان بکەن کاتێك بریار دەدەن کە ئایا کەسێك درۆ دەکات یان ڕاست دەکات ، بۆ نموونە: زانایان دەریان خستووە بۆ دۆزینەوە درۆ لە تۆنی دەنگ ، کە هاولاتیانی ولاتی صین یان چینی لە کاتی درۆ کردندا کاتێك قسە دەکەن تۆنی دەنگیان بەرز دەکەنەوە ، هەروەها هاولاتیان ولاتی ئەسپانیان لە کاتی درۆ کردن کاتێك قسە دەکەن تۆنی دەنگیان نزم دەکەنەوە ..؟!

### ٦-جوولەی ئاراستەی چاوەکان :

بەلیٚ راستگۆیی و پەیوەندی چاو هەیە ، ئەمەش باوەریٚکی کەلتووریە بۆ نموونە: ئەگەر کە سەکە درۆ زن بیٚت ، ئەوە لە کوردەواری پیٚ دەلیٚن : چاوی حیزە ، یان راستگۆ نیە چاوی کزە شتی تری باسکراوە ، یان ووتراوە: لە کاتی درۆ کردن جوولە بە ئاراستەکردنی چاو دەکریٚت ، بەلای چەپ یان بەلای راست دەکەن لە کاتی درۆ کردندا ، کەواتە دەبیٚت ئەوا بزانین لە کاتی قسە کردن دا سەیر چاوەکانی بکەین ئایا جوولەی زۆر دەکەن ، یان راستگۆییە ، ئەگەر کەسی قسەکەر یان درۆز راستەو خۆ سەیری چاوەکانی نەکردی ، ئەوا دەرخەری ئەوەی کە درۆ دەکات ،هەروەها بە پیٚچەوانەشەوە ئەگەر هیچ جوولەی نەرکرد بە چاوەکانی ئەوا ئەو کەسە راستگۆیە ..؟!

### ٧-داپۆشینی دەم چاو :

بەلیٚ زۆر کەس دەیانەویٚت درۆیەك بشارنەوە یان کاردانەوەی خۆیان بشارنەوە ، ئەوا لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە دەستیان لەسەر چاو یان دەمیان دابنیٚن کاتیٚك درۆ دەکەن ، کەواتە : ئەوانەی درۆ دەکەن لەوانەیە بە تەواوی چاویان دابخەن کاتیٚك درۆ دەکەن ، بۆ نموونە : کاتیٚك کەسی درۆزن وەلامی پرسیاریٚك دەداتەوە کە پیٚویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆر نیە ، بۆیە لە کاتی درۆ کردندا یەکسەر چاو یان دەمی دادەخات یان جوولەیەکی سەیر بەم دووانە دەکات ، ئەم نیشانەیەش بە تیبەتی لەو کەسانە دایە ، کە نایەویٚت درۆ بکە ، بەلام بارودۆخەکەی زۆر قورس و سەختە بە ناچاری درۆ کە دەکات ، بۆیە جوولەی سەیر لیٚی نیشان دەدریٚت ، چونکە بارودۆخەکەیان وادەخوازیٚت کە درۆکە بکەن ، ئەوانیش بە ناچاری درۆ هەلدەبژیٚرن ..؟!

٨–زیادەرەوەی لە جوولە کردن :

بەڵێ بۆ نموونە : بیر لەوە بکەوە کاتێك منداڵەکەت چی دەکات کاتێك پرسیاری ئەوەی لێ دەکەیت کە یاریەکەی بۆت کری بوو چی لێکردووە ..؟! لە کاتێکدا پێت ووتبوو : ئەم یاریە وون نەکەیت ..؟! ئەو کاتە لەوانەیە منداڵەکە لێوەکانی جوولە پێ بکات یان لێوەکانی بە جۆرێك بجوولێنێت و سەیر نینۆکەکانی خۆی بکات ، یان تەنانەت دەستی بکوشێنێت ، لەداویشدا دۆریەکی زۆر گەورە بکات ..! ! بەدڵنیایەوە ئەم کردانەوەیە لە ئەنجامی ئەوە دروست دەبێت کە تووشی هەڵوێست و موقف و باردۆخێك هاتووە خۆی تێدا دەرباز بکات ، یان تووشی دڵەراوکی قلەقی بووە و ترسی ئاشکرابوونی راستیەکانی هەیە کاتێك کە پرسیاری لێکراوە ، هەر بۆیە کاریگەری جەستەی زۆر دروست دەبێت ، ئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی ناسینەوەی کەسی درۆزن ..؟!

٩–ئاماژەی پەنچەکان :

بەڵێ کرداری ئاماژەکردن بە شتێك یان ئاماژەکردن بەرەو شتێکی تر یان کەسێکی تر ، بە پەنچە یان زۆر چار بە چاو ئەمەش روودەدا ، یان دەرباز بوون لەم درۆیە ئاماژەی پەنچەی بۆ کەسێکی ترە ، ئەمەش لەوانیە نیشانەیەك بێت بۆ لابردنی تیشك خستنە سەر کەسێك بە لۆمە کردنی کەسێکی تر ، بۆ نموونە :ئەم کردارە بەسەر خۆم داهاتووە یەکێك لە هاو پیشەکانم ئەمەی کرد ، لە کاتی کار کردندا ، ویستی درۆ کەی خۆی پەردەپۆش بکات یان خۆی رزگار بکات لەو پرسیارەی کە لێ یان کردووە ، وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە خۆی لێ دەرباز کردوو ، ئاماژەی بەمن کرد گویایە من خەتابارم ، کەچی تەنها خۆ بۆ دەرباز کردن بوون ، لە پرسیارەکەی لێ یان کرد..؟!

۱۰–ڕەوا بوونی درۆ کەی بەوەی کە باش بوو پێ ئەو درۆیەی کرد:

کاتێك کەسێك لە پێش چاوی تۆ باسی ئەوەی کرد چۆن درۆیکردووە و تەنانەت ئەوەی وەك شتێکی ئاسایی و باش باسکرد ، ئەوا بێ دوو دلی لێی دوو بکەرەوە، لەوانە ئاسانترین ڕێگا بۆ بینینی درۆزن ئەوە بێت کە ڕێگەیان پێ بدەیت درۆت بۆ بکەن ، بەڵێ ئەوانەی کە خۆیان بە درۆزنە باشەکان دەناسێنن دەتوانرێت ئەوە بزانرێت لەسەریان کە لە ڕاستیدا کەسانی درۆزنە ، بۆیە ئەگەر کەسێك شانازی بەوە بکات کە درۆزنێکی زۆر باشە ، ئەوە بەدڵنیایەوە کەسێکی زۆر خراپەکارو درەندەو قێزەونە ، ئیتر کەس متمانەی پێ ناکات ، بەردەوام سەر گەردانە بە هۆی درۆکانیەوە ، با بۆ ماوەیەك درۆ کانی سەر بگرێت ، بەڵام دەرئەنجامێکی زۆر ڕەش چاورێتی..؟!

لەکۆتایی دا بۆ ئەوەی بزانین مەرج نیە ئەو کەسەی کە ئەم نیشانانەی هەیە ڕاستەخۆ بە کەسێکی درۆزن پۆلێنی بکەین ، وە لێ دووربکەوینەوە ، بەڵکو هەولبد زیاتر وویابیت دەربارەی ئەو کەسانەی نیشانانەیان هەیە ، هەروەها بە ئاسانی متمانەیان پێ مەکە ، بە ئاگاییەوە مامەلە یان لەگەل ئەو کەسانە بکە ، وە زیاتر بیانناسە تا خۆت و دەروون و مێشکت بپارێزیت ..؟!هەروەها ڕێگایەکی تریش بۆ دۆزینەوەی ئەو کەسانەی درۆزنن ئەوەی کە ببیت بە لێکۆلینەوەی یان کەسێك پیشەی تحقیقە لە تاوانکاریەکان ، فێری پسپۆرانی ئەم بوارە بکە ئەوا زیاتر درۆزنەکان دەناسیت ، وەك دادوەران و لێکۆلینەوە لە بنکەکانی پۆلیس ، یان ئەو شوینانەی کە تێدا بەپرسیارەتی هەیە ، کەسانێکی درۆزن بۆ بەرژەوەندیەکانیان خۆیان لێ نزیك دەکەنەوە ، ئیتر کەسی درۆزن درۆ کەی بۆ هەتاهەتایی هەر ئاشکرا دەبێت ، وا ناسینەوەشیان زۆر ئاسانە ئەگەر بە ووردی لێ کۆلینەوەیان لەگەل بکەین ، بەلام نزیك بوونەوە لێیان زۆر خراپە ، بۆنموونە وەك کوورە وایە یان ئەوەتا جل و بەرگت تێدا دەستوتێت ، یان ئەواتا بوونی ناخۆشی کوورەکە دەتگرێ ، بۆیە هاورێیەتی و ڕەفاقەتی لە گەل کەسی درۆزن بۆ هەمیشە مال وێرانیە ..؟!

# نەهامەتیەکانی درۆ کردن لەسەر تاك و کۆمەلگا

١-هۆکاری تیا چوونی تاك و کۆمەلگایە .

٢-هۆکاری تیا چوونی ولاتانە .

٣-درۆ کردن خاوەنەکەی بەرەو دۆزەخ دەبات .

٤-درۆ کردن کەسایەتی مرۆڤ لاواز دەکات ، لای خەلکانی باش رووخساری ناشرین دەکات.

٥-درۆزن دزە و فساد و گەندەلە ، چونکە درۆ ژیری مرۆڤەکان ئەدزێت هەر وەکو چۆن دز مال ئەدزێت .

٦-درۆزن کەسێکی بێ شەرم و دزە ، لەلای خەلکی بە سووك سەیر دەکرێت .

٧-گەلی درۆزن تیاچوونی مسۆگەر یان بە رووداویی سروشتی یان بە هاتنی زەوالەیەك .

٨-گەلی درۆزن رەزق رۆزیی کەم دەبێت ، نیعمەتەکانی (خوای گەورە ) نارژێت بەسەریان .

٩-گەلی درۆزن بەردەوام تووشی نەهامەتی و قەیرانی ئابووری دەبێت ، ئەم قەیرانە کۆتایی دێت قەیرانێکی تر رووی تێدەکات .

١٠-درۆکردن دین و دنیای خاوەنەکەی لە ناو دەبات .

١١-درۆکردن بەلگەیە لەسەر سووك چروکی و نەفس نزمی و بێ شەرمی خاوەنەکەی .

١٢-درۆکردن ستەم لەنەفسی خۆی و کۆمەلگاکەشی دەکات .

١٣-درۆزن تارماییە ،دوورەکان نزیك دەکاتەوە ، وە تارماییە نزیکەکان دوور دەکاتەوە .

١٤درۆزن خۆی بەر نەفرەتی (خوای گەورە ) دەکات .

١٥-درۆزنە بەلگەی لاوازی ئیمانە ، وە بەلگەی حەیاو بێ شەرمیە .

١٦-هیچ شتێك سوودی نیە لەگەل درۆزن بکرێت تەنها دوور کەوتنەوە لێی .

١٧-درۆکردن بەناوی ئیسلامەوە تاوانەکەی گەورەترە لەوەی کەسێك درۆ بکات بۆ دونیا .

سەر باسە کان

١-پیشەکی ------------------------------------------------١-٢
٢-پێناسەی درۆ کردن -------------------------------------------٣-٤
٣-باسی درۆ کردن------------------------------------------٥
٤-ئەو ووشانەی کە هەمان واتای (الكذب)ی هە یە لە قورئانی پیرۆزدا ----------٦-٧
٥-ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی درۆکردن ---------------------------------٨
٦-پەتی درۆ کردن کورتە ------------------------------------------٩
٧-تاوانی درۆ هەلبەستن و بوختان کردن ------------------------------١٠-١٤
٨-زیانەکانی بوختان کردن و درۆ هەلبەستن ---------------------------١٥-١٦
٩-توورەیی (خوای گەورە ) لە درۆزنان لە قورئانی پیرۆزدا ----------------١٧-٢٣
١٠- دوو روویی یان نیفاق پەیوەندی بە درۆکردن ---------------------------٢٤
١١-زیانی کوشندەیی نیفاق یان دوو روویی ------------------------------٢٥-٢٦
١٢-سیفەتەکانی کەسی دوو روو یان نیفاق ------------------------------٢٧-٣١
١٣-جۆرەکانی نیفاق یان دوو روویی ---------------------------------٣٢-٣٣
١٤-دەربارەی نیفاق یان دوو روویی لەم زەمانەدا ------------------------٣٤-٣٧
١٥-ناسینەوەی کەسانی مونافق یان دوو روو --------------------------٣٨-٤١
١٦-رێگاکانی خۆپاراستن لە نیفاق یان دوو روویی -----------------------٤٢-٤٨
١٧-درۆکردن هۆکارێکە بۆ (فاسق ) بوون ----------------------------٤٩-٥١
١٨-جۆرەکانی (فاسق ) یان لادان ----------------------------------٥٢-٥٣
١٩-کێن سیفەتی فاسقیان هەلگرتووە ---------------------------------٥٤-٥٧
٢٠-زیانەکانی کەسی فاسق لە سەر خۆی و لە سەر کۆمەلگادا ---------------٥٨
٢١-درۆ کردن یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ------------------------------٥٩-٦٢
٢٢- ئەو هۆکارانەی دەبنە پالنەر بۆ درۆکردن ----------------------------٦٣
٢٣- خوو گرتن بە درۆ کردن -------------------------------------٦٤
٢٤-سزا یان هەرەشەکانی (خوای گەورە ) لە کەسانی درۆزن ------------٦٥-٧٠
٢٥-دەرئەنجامی کاریگەریەکانی درۆ کردن لەسەر تاك و کۆمەلگادا----------٧١-٧٧

٢٦-گێرانەوەی ڕووداوی (الافك)------------------------------٧٨-٨٦
٢٧-كارێگەریەكانی درۆ كردن لە سەر كۆمەلگادا ----------------------٨٧-٨٩
٢٨-دیاردەی درۆ كردن -----------------------------------٩٠-٩٣
٢٩-پالنەرەكانی درۆكردن و هاندان بۆ چارەسەریەكان-----------------٩٤-٩٥
٣٠-خۆ رزگار كردن لە رەوشتی درۆ كردن وە هاوشێوەكانی لە قسەكردندا -----٩٦-١٠٢
٣١-درۆ كردن بۆ گالتە و خۆشی خۆ هەلكێشان -----------------------١٠٣
٣٢-درۆ كردن رووخسار رەش دەكات -----------------------------١٠٤
٣٣-درۆ لەگەل نەفسی خۆت مەكە -------------------------------١٠٥
٣٤-بۆچی كەسی درۆزن درۆ دەكات ..؟!----------------------------١٠٦
٣٥- بۆچی پێویستە درۆ نەكەین ..؟!------------------------------١٠٧
٣٦-درۆی مەصلەحەت-----------------------------------١٠٨-١١١
٣٧-سزای درۆ و بوختان هەلبەستن -------------------------------١١٢
٣٨-چەندین هۆكار هەن وادەكات مرۆڤ درۆ بكات -------------------١١٣-١١٥
٣٩-چی بكەین بۆ ئەوەی بیّ درۆ كردن بەژوەندیەكانمان بپارێزین ..؟!-----------١١٦
٤٠-ناسینەوەی ئەو نیشانانەی كەوا دەری دەخات مرۆڤ درۆ دەكات -------١١٧-١٢٣
٤١-نەهامەتیەكانی درۆ كردن لە سەر تاك و كۆمەلگادا --------------------١١٨
٤٢-سەر باسەكان ------------------------------------١٢٥-١٢٦

